## بینینی جبریل علیه السلام

✍(١٢٧)عن عائشة أم المؤمنين رضي الله عنه قال : قال رسول الله ﷺ :(( إِنَّما ذلكَ جبريلُ ، و ما رأيْتُهُ في الصُّورَةِ التي خُلِقَ فيها غيرَ هاتَيْنِ المَرَّتَيْنِ رأيْتُهُ مُنْهَبِطًا مِنَ السَّماءِ ساداً عِظَمُ خلقهِ ما بين السَّماءِ و الأرضِ ))[127].

واته : له دایکه عائیشه وه رضي الله عنها ده گێڕیتەوه دەلیت : پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەوه جبریل بوو ، جگه لەم دوو جاره هەرگیز له شیوەی راسته قینەی خۆی نەم دیوه بینیم له نیوان ئاسمان هاته خوارەوه و پیشی ئاسمانی گرتبوو به تەواوی گەورەیەکەی له نیوان ئاسمان و زەویدا دەرکەوت ..!!

[127] شيخ الالباني في صحيح الجامع برقم (٢٣٦٢)، سنن الترمذي برقم (٣٥٧٥) .

## پچراندنی نیگا

✍(١٢٨)عن جابر بن عبدالله رضي الله عنه قال : انة سمع رسول الله ﷺ يقول : ((فَتْرَةِ الوَحْيِ: فَبيْنَا أنَا أمْشِي سَمِعْتُ صَوْتًا مِنَ السَّمَاءِ، فَرَفَعْتُ بَصَرِي قِبَلَ السَّمَاءِ، فَإِذَا المَلَكُ الذي جَاءَنِي بحِرَاءٍ قَاعِدٌ علَى كُرْسِيٍّ بيْنَ السَّمَاءِ والأرْضِ، فَجَئِثْتُ منه حتَّى هَوَيْتُ إلى الأرْضِ، فَجِئْتُ أهْلِي فَقُلتُ: زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي، فَزَمَّلُونِي، فأنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: {يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ * قُمْ فَأَنْذِرْ} إلى قَوْلِهِ: {فَاهْجُرْ} ﴿المدثر: ١-٥﴾)).[128]

واته : له جابری كوری عبدالله رضي الله عنه دەگێرتەوە دە لیت : گویم له پیغەمبەری خوا ﷺ بوو دەی فەرموو : ماوەیەك بوو ، جاریك بە پی دە رۆیشتم لە نا كاو گۆیم لە دەنگیك بووله ئاسمانەوە هات منیش خیرا سەرم بەرزكردەوە بۆ ئاسمان و بینیم ئەو فریشتەیەی كە یەكەم جار لە ئەشكەوتی (حراء) وحی بۆ هینام مەبەستی جبریل لە ،ئەوە خۆیەتی و لەسەر كورسیە ك لە نیوان ئاسمان زەویدا دانیشتووە منیش ئەوەندە لی ترسام بەسەر زەویدا كەوتم پاشان گەرامەوە بۆ لای خەدیجە (رضي الله عنها) وە پیم ووت : دام پۆشە دام پۆشە ئەویش جیگای بۆ هینام دای پۆشیم یە كسەر لەدوای ئەوە جبریل – عليه السلام – هاتە لام ئەم ئایە تەی بۆهینان سورەتی {يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ * قُمْ فَأَنْذِرْ} إلى قَوْلِهِ: {فَاهْجُرْ} ﴿المدثر: ١-٥﴾)).

## كاتی دابەزینی نیگا پیغەمبەری خوا ﷺ سەری موبارەكی نیوی دەكرد

[128] صحيح البخاري برقم (٤٩٢٦) .

✍(١٢٩) عبادة بن الصامت رضي الله عنه قال :

((كان إذا أُنزِل عليه الوحيُ نكَّس رأسَه و نكَّس أصحابُه رؤوسَهم ، فإذا أقلع عنه رفع رأسَه)) .[129]

واتە: لە عبادەی کوڕی صامت رضي الله عنه دە گێرتەوە دەڵێت :

پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی دابەزینی نیگا سەری موبارەکی نیوی دەکرد ،هەواڵە کانیش هەر هەموویان بەدوایەوە سەریان نیوی دەکرد ،کاتی نیگا تەواو دەبوو جبريل (عليه السلام ) دە ڕۆیشت هەموویان سەریان بەرز دە کردەوە ..!!

تێبینی / لەکاتی دابەزینی وحی یان نیگا ، وادیارە ئەوەند قورس و زەحمەت بووە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ وە ك بە مرۆڤ هیلاکو ماندووی کردووە ، هەروەها لە کاتی دابەزینی دیارە ئەو کەسانەی کە لەدەوربەری پێغەمبەری خوا ﷺ بوونە ، هەستیان بە وحی نیگا کردووە ، قورسی نارەحەتی بۆ ئەوانیش بووە ، (خوای گەورە زاناترە )..!!

نیگا لە شێوەی زەنگی جرەسدا

[129] صحيح مسلم برقم (٢٣٣٥) ، وشيخ الالباني في صحيح الجامع برقم (٤٦٨٦).



✍(١٣٠)عن عائشه أم المؤمنين (رضي الله عنها ) قال :

((أنَّ الحارثَ بنَ هشامٍ سألَ رسولَ اللَّهِ ﷺ ، كيفَ يأتيكَ الوحيُ ؟ فقالَ رسولُ اللَّهِ ﷺ: أحيانًا يأتيني في مثلِ صلصلةِ الجرَسِ ، وَهوَ أشدُّهُ عليَّ ، فيَفصِمُ عنِّي ، وقد وَعَيتُ ما قالَ " وأحيانًا يتمثَّلُ ليَ الملَكُ رجلًا ، فيُكَلِّمُني فأعي ما يقولُ)).[١٣٠]



واته : له عائشەی دایكی ئیمانداران (رضي الله عنها ) دەلی :

حاریث كوری هشام پرسیاری كرد له پیغەمبەری خوا ﷺ چۆن نیگات بۆ دیت ..؟! فەرمووی :له وینەی دەنگی زنگیگ بۆم دیت كه زۆر قورس و گرانه لەسەرم ، پاشان قورسیه كه لا دەچی و ، هەرچیم پی ووتراوە هەر هەمووی تی گەیشتووم ، جار جاریش نیگام بۆ دیت فریشتەی نیگا جبریل (علیه السلام ) لەسەر شیوەی گه نجیك پیم دە گەینی له سەر شیوەی پیاویك دیت بۆ لام پەیامەكەی پیم رادەگەیەنی و پیم دەلیت و منیش راستەخۆ تیدەگەم و لەبەری دەكەم ..!!

تیبینی / نموونەی : دەنگی جرسی هەزەی مۆبایلی ئیستا ،كە هەیه كاتیك جرس لیدەدات دەبیته هەزه زۆر ناخۆشه ئەگەر له شوینیكی هەستیار مۆبایله كه دا بنی بەراستی قورس ناخۆشه جستەت هیلاك دە كات ( خوای گەورە زانا ترە )..!!



[١٣٠] سنن النسائي برقم (٩٣٣) ، ومسلم برقم (٢٣٣٣).

(١٣١) عن عباده بن الصامت رضي الله عنه قال :

((كانَ نَبِيُّ اللهِ ﷺ إذا أُنْزِلَ عليه الوَحْيُ كُرِبَ لِذلك وَتَرَبَّدَ وَجْهُهُ)).[131]

واتە : لە عبادەی كوری صامت دەگیریتەوە دەلیت :

پیغەمبەری خوا ﷺ لە كاتی دابەزینی نیگا دا ، باری لاشەی یان جستەی قورس و گران دەبوو ، وە رەنگی دەم و چاوی دە گۆرا ..!!

[131] صحيح مسلم برقم (٢٣٤٣).

✍(١٣٢)عن عائشه أم المؤمنين (رضي الله عنها ) قال :

((أنَّ الحارثَ بنَ هشامٍ سألَ رسولَ اللَّهِ ﷺ ، كيفَ يأتيكَ الوحيُ ؟ فقالَ رسولُ اللَّهِ ﷺ : أحيانًا يأتيني في مثلِ صلصلةِ الجرَسِ ، وَهوَ أشدُّهُ عليَّ ، فيَفصِمُ عنِّي ، وقد وَعَيتُ ما قالَ " وأحيانًا يتمثَّلُ ليَ الملَكُ رجلًا ، فيُكَلِّمُني فأعي ما يقولُ ، قالت عائشة : ولقد رأيته ينزل عليه فى اليوم الشديد البرد فيفصم عنه وإن جبينه ليتفصد عرقا )).[١٣٢]

واتە : لە عائشەی دایکی ئیمانداران (رضي الله عنها ) دەڵی :

حاریث کوری هشام پرسیاری کرد لە پیغەمبەری خوا ﷺ چۆن نیگات بۆ دیت ..؟! فەرمووی : لە وینەی دەنگی زنگیگ بۆم دیت کە زۆر قورس و گرانە لەسەرم ، پاشان قورسیە کە لا دەچی و ، هەرچیم پی ووتراوە هەر هەمووی تی گەیشتووم ، جار جاریش نیگام بۆ دیت فریشتەی نیگا جبریل (علیە السلام ) لەسەر شیوەی گە نجیك پیم دە گەینی لە سەر شیوەی پیاویك دیت بۆ لام پەیامەکەی پیم رادەگەیەنی و پیم دەلیت و منیش راستەخۆ تیدەگەم و لەبەری دەکەم هەروەها دایکە عائیشە دەلیت : من بینیومە لە رۆژیکی زۆر سارد دا نیگا بۆ پیغەمبەری خوا ﷺ دابەزیوە ،ناو چەوانی ئارەقی هاتۆ تە خوارە وە..!!

[١٣٢] سنن النسائي برقم (٩٣٤).

## دابەزینی نیگا لە شێوەی الرویا صالحە یان خەوی باش

(١٣٣) عن عائشة أم المؤمنين قال :

(( أَوَّلُ ما بُدِئَ به رَسولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ الرُّؤْيَا الصَّادِقَةُ جاءَهُ المَلَكُ، فَقالَ: {اقْرَأْ باسْمِ رَبِّكَ الذي خَلَقَ، خَلَقَ الإنْسَانَ مِن عَلَقٍ، اقْرَأْ ورَبُّكَ الأكْرَمُ الذي عَلَّمَ بالقَلَمِ} )).[١٣٣]

واتە : لە دایکە عائیشە ﵂ دە گێریتەوە دەلی :

لە سەرە تادا کە نیگا دەستی پی کرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتنی جبريل (عليه السلام) بە رۆویا صالحە ، یان خەوی باش بوو ، بە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : {اقْرَأْ باسْمِ رَبِّكَ الذي خَلَقَ، خَلَقَ الإنْسَانَ مِن عَلَقٍ، اقْرَأْ ورَبُّكَ الأكْرَمُ الذي عَلَّمَ بالقَلَمِ}..!!

[١٣٣] صحيح البخاري برقم (٤٩٥٦)،
✍📖نووسینە وە ی فە رموودە کانی ﷺ
بحر الحديث- دە ریای فە رموودە

(١٣٤) عن عائشة أم المؤمنين قال :

(( أَوَّلُ ما بُدِئَ به رَسولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ مِنَ الوَحْيِ الرُّؤْيَا الصَّادِقَةُ في النَّوْمِ" فَكانَ لا يَرَى رُؤْيَا إلَّا جَاءَتْ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ، فَكانَ يَأْتي حِرَاءَ فَيَتَحَنَّثُ فيه وهو التَّعَبُّدُ اللَّيَالِيَ ذَوَاتِ العَدَدِ ويَتَزَوَّدُ لذلكَ، ثُمَّ يَرْجِعُ إلى خَدِيجَةَ فَتُزَوِّدُهُ لِمِثْلِهَا، حتَّى فَجِئَهُ الحَقُّ وهو في غَارِ حِرَاءٍ، فَجَاءَهُ المَلَكُ فيه، فَقالَ: اقْرَأْ، فَقالَ له النَّبيُّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ: فَقُلتُ: ما أنَا بقَارِئٍ، فأخَذَنِي فَغَطَّنِي حتَّى بَلَغَ مِنِّي الجَهْدُ، ثُمَّ أرْسَلَنِي فَقالَ: اقْرَأْ، فَقُلتُ: ما أنَا بقَارِئٍ، فأخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّانِيَةَ حتَّى بَلَغَ مِنِّي الجَهْدُ، ثُمَّ أرْسَلَنِي فَقالَ: اقْرَأْ، فَقُلتُ: ما أنَا بقَارِئٍ، فأخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّالِثَةَ حتَّى بَلَغَ مِنِّي الجَهْدُ، ثُمَّ أرْسَلَنِي فَقالَ: {اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ} حتَّى بَلَغَ {عَلَّمَ الْإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ} ﴿العلق: ١ – ٥﴾. فَرَجَعَ بهَا تَرْجُفُ بَوَادِرُهُ، حتَّى دَخَلَ علَى خَدِيجَةَ، فَقالَ: زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي، فَزَمَّلُوهُ حتَّى ذَهَبَ عنْه الرَّوْعُ، فَقالَ: يا خَدِيجَةُ، ما لِي؟ وأَخْبَرَهَا الخَبَرَ، وقالَ: قدْ خَشِيتُ علَى نَفْسِي، فَقالَتْ له: كَلَّا، أبْشِرْ، فَوَاللَّهِ لا يُخْزِيكَ اللَّهُ أبَدًا" إنَّكَ لَتَصِلُ الرَّحِمَ، وتَصْدُقُ الحَدِيثَ، وتَحْمِلُ الكَلَّ، وتَقْرِي الضَّيْفَ، وتُعِينُ علَى نَوَائِبِ الحَقِّ، ثُمَّ انْطَلَقَتْ به خَدِيجَةُ حتَّى أتَتْ به ورَقَةَ بنَ نَوْفَلِ بنِ أسَدِ بنِ عبدِ العُزَّى بنِ قُصَيٍّ، وهو ابنُ عَمِّ خَدِيجَةَ" أخُو أبِيهَا، وكانَ امْرَأً تَنَصَّرَ في الجَاهِلِيَّةِ، وكانَ يَكْتُبُ الكِتَابَ العَرَبِيَّ، فَيَكْتُبُ بالعَرَبِيَّةِ مِنَ الإنْجِيلِ ما شَاءَ اللَّهُ أنْ يَكْتُبَ، وكانَ شيخًا كَبِيرًا قدْ عَمِيَ، فَقالَتْ له خَدِيجَةُ: أيِ ابْنَ عَمِّ، اسْمَعْ مِنَ ابْنِ أخِيكَ، فَقالَ ورَقَةُ: ابْنَ أخِي، مَاذَا تَرَى؟ فأخْبَرَهُ النَّبيُّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ ما رَأَى، فَقالَ ورَقَةُ: هذا النَّامُوسُ الذي أُنْزِلَ علَى مُوسَى، يا لَيْتَنِي فِيهَا جَذَعًا، أكُونُ حَيًّا حِينَ يُخْرِجُكَ قَوْمُكَ، فَقالَ رَسولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ: أوَمُخْرِجِيَّ هُمْ؟ فَقالَ ورَقَةُ: نَعَمْ" لَمْ يَأْتِ رَجُلٌ قَطُّ بمِثْلِ ما جِئْتَ به إلَّا عُودِيَ، وإنْ يُدْرِكْنِي يَوْمُكَ أنْصُرْكَ نَصْرًا مُؤَزَّرًا، ثُمَّ لَمْ يَنْشَبْ ورَقَةُ أنْ تُوُفِّيَ. وفَتَرَ الوَحْيُ )).[١٣٤]

[١٣٤] صيحيح البخاري باب بدة الوخي برقم(٦٩٨٢) و مسلم كتاب الايمان باب بدء الوحي ص(١٦٠/١) او (٤٠١) .

وته: دایکه عائیشه وه ( خوا لی رازی بیت ) ده ی گیرته‌وه ده‌لی
:له سه‌رتا دا کاتی نیگا ده‌ستی پی کرد بۆ پیغه‌مبه‌ری خوا ﷺ
له شیوه‌ی روویا صالحه یان خه‌ونی راست بوو ، به‌وینه‌ی
شه‌به‌قی به‌یانیان ده‌هاته دی ، له پاشان دا پیغه‌مبه‌ری خوا
ﷺ که‌م که‌مه یان به‌ره به‌ره ئاره زووی له ته‌نهایی و گۆشه
گیری و خه‌لوه‌تبوو ، جا ده‌ستی کرد به خه‌لوه‌ت کیشان له
ئه‌شکه‌وتی حراء ، له‌ویدا هه‌موو جاریك چه‌ند شه‌وی به‌ژماره
ده‌مایه‌وه و لی ده‌برا بۆ ( خوای گه‌وره ) عیاده‌ت و خوا په‌رستی
ده کرد ، له‌و ماوه‌یه دا سه‌ردانی که‌س و کاری نه‌ده‌کرد
نه‌ده‌چووه لایان گۆشه گیر ببوو ،وه بۆ ئه‌مه‌ش نان خورمای له
گه‌ل خۆ دا ده‌بر ،ئینجا ده‌گه‌رایه‌وه بۆ لای ماله‌وه بۆ لای
خه‌دیجه ی هاوسه‌ری و ، سه‌ر له نوی نان خورمای له گه‌ل خۆ دا
ده برد ده گه‌رایه‌وه بۆ ئه‌شکه‌وتی حراء جا به‌م شیوه‌یه بۆ
ماوه‌یه‌ك به‌رده وام بوو ،هه تا کو له پر یان له ناکاو له
ئه‌شکه‌وتی حراء ، جبریل ( علیه السلام ) فریشته‌ی نیگا یان
وحی بۆ ده هینی و دیته لای پی ده فه‌رمووی : إقراء واته:
بخوینه ..!؟، پیغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رمووی : ما أنَا بقَارِئٍ ..!!
واته : من خوینده واریم نیه ..!!

هەروەها پیغەمیەری خوا ﷺ فەرمووی: جا جبریل گرتمی و کوشیمی بە سینگی خۆیەوە تاکو هیزی لی بریم ، ئینجا بەری دام فەرمووی : بخوینە ..؟! سی جار بەم شیوەیە ، فەرمووی ووتم : چی بخوینم خۆمن خویندە واریم نیە ..!! دیسانەوە کوشیمیەوە بە خۆیەوە تا هیزو وزەم لی برا و تەواو ماندوو بووم ،دیسان بەری دامەوە و فەرموویەوە : بخوینە ..؟! دیسان گوتمەوە ،خۆمن خویندەواریم نیە ..!! بۆ جاری سیەم گرتمی کوشیمی بە خۆیەوە ،تاکو هیز تاقەتم لی برا ، ئینجا بەری دامەوە فەرمووی : ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ (١) خَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ (٢) اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ (٣) الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ (٤) عَلَّمَ الْإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾ ئینجا پیغەمبەری خوا ﷺ خوێندیەوە بەم ئایە تەوە دە گەریتەوە مالە وە ، سام دەی گری دلی دەلەرزی و دە رواتەوە بۆ لای خدیجەی کچی خویلد ، کە هاوسەری بوو ، پیغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووی : دام پۆشن دام پۆشن ،تا ترس و سامەکەی نیشتەوە ، ئینجا ئەم باسە دە گیریتەوە بۆ خەدیجە ی هاوسەری ،دەفەرمووی : بە خوا من زۆر ترسام کە بمرم ئەوەندە هیزو وزەو ماندوو هیلاك و سام ناك بوو ،خەدیجەش دەفەرمووی : منیش ووتم : بە خودا ( خوای گەورە ) هەر گیز خودا شتی وا ناکات تۆ شەرمەزار ناکات ، چونکە دانایی و بەهەرەوەری تۆ بی وینەیە ..!!

تۆ پیاویکی خزم دۆستی خزمەتی خەلك دە کەیت پیاویکی کە خۆت باری ئازاری خەلك دەخەیتە سەر شانی خۆت و کۆمەکی بی نەوایان و هەژاران دەدەی ،هەروەها خاون نان و دیوەخانیت کەچی شتی واچاکە بەخەلك دەبەخشیت ،کە بەهەموو کەسی کە نا بە خشری و میواندارِیی بەمیوان دەکەی و یاریدەی لیقەوماوان دەدەی ،بە کورت و پوختی پیاویکی خاون کۆمەکیت بۆ هەژارو لیقەوماوان یارمەتی دەری لاوازەکانی ، ئینجا خەدیجە لە خزمەتی دا دەروات بۆ لای ( وەرەقەی کوری نوفل ی کوری ئەسەدی کوری عبدالعوززا ) کە دەکاتە ئامۆزای خەدیجەی هاسەری پیغەمبەری خوا ﷺ ،لە سەردەمی نەفامیدا ئەو پیاوە بوو بە نصرانی یان مسیحی ، هەروەها ( وەرەقەی کوری نوفل ) نووسینی عیبرانی دەزانی ،ئەوەند خوا حەزکا ، ئینجیلی نصرانی بە عیبرانی دەنووسیەوە ،خۆی پیرمیردیکی ئیختیارو بەسلا چوو و کویر بوو بوو ،ئینجا خەدیجە پی دەلی : ئەی ئامۆزا گوی لە بەرازاکەت بگرە بزانە دەلی چی ..؟! وەرەقەی کوری نوفل دەلی : ئەی کوری برام ئادەی پیم بلی چی دەبینیت ..؟! پیغەمبەریش ﷺ هەرچی دی بوو بۆی گیرایەوە ، وەرقە پی ووت : ئەمە هەمان فریشتەیە کە ئەمین و پیرۆزە ..!! کە لە کاتی خۆیدا ( خوای گەورە ) نار دووی بۆ لای موسا ( علیه السلام ) ...

ئەوە جبریلە ئەمینداری وەحی نیگایە ،ناسراوە لە ناو خاوەن نامە کاند بە (الناموسا) خۆزگەم لە کاتی ئاشکرا بوونی پیغەمبەرایەتی تۆ دا من گەنج دەبووم..!! ، خۆزگە ئەو سەردەمە من دەمام و زیندو دەبووم..!! خۆزگە نەدە مردم تا ئەو رۆژەی کە گەلەکەت لە (مككة) دە تخەنە دەرەوە ، پیغەمبەریش ﷺ فەرمووی : بۆچی خزمانی من شتی وادەکەن و لە (مككة) دەمخەنە دەرەوە ..؟! وەرەقە کوری نوفل دەلی : بەلی . چونکە هەر پیاویك داویەکی وەکو ئەم داوا رەوایەی تۆی هینابیت یان پەیامیکی وەکو ئەم پەیامە حەقەی تۆی هینا بیت ..!! مسۆگەر گیچەل و تانە تەشەنەو بەدرۆیان خستەوە رقیان لی بووە وە دوژمنایەتیان کردووە ، وە هەروەها وەرەقەی کوری نوفلە ووتی : ئەگەر من فریای ئەورۆژە پیرۆزەت دەکەتم کە بانگەوازەکەت ئاشکرا دەکەی ، یارمەتیە کی زۆر باشم دەدای ،ئیتر وەرقەی کوری نوفل ئەوەندەی نەبرد کە وەفاتی کرد ،ئیتر لە دوا ئە مجارە تاوەی (٣)سال نیگا یان وەحی وەستا یان پچرا ،لەو ماویەدا جبریل (علیه السلام) نەهاتەوە بۆ خزمەت پیەمبەری خوا ﷺ ..!!

# هاتنى جبريل ( عليه السلام ) له مانگى ڕەمەزان

✍( ١٣٥ )عن عبدالله بن عباس ﵄ قال : قال رسول الله ﷺ:

(( كانَ رَسولُ اللَّهِ ﷺأجْوَدَ النَّاسِ، وكانَ أجوَدُ ما يَكونُ في رَمَضَانَ حِينَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ، وكانَ جِبْرِيلُ يَلْقَاهُ في كُلِّ لَيْلَةٍ مِن رَمَضَانَ، فيُدَارِسُهُ القُرْآنَ، فَلَرَسولُ اللَّه صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ حِينَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ أجْوَدُ بالخَيْرِ مِنَ الرِّيحِ المُرْسَلَةِ )).[١٣٥]

واته : له عبدالله كورى عباس ﵄ دەگێرتەوە دەلیت : پيغەمبەرى خوا ﷺبۆ بەخشندەيى پياوەتى له وينەى خۆى نەبوو ، له شەوى ڕەمەزاندا جبريل ( عليه السلام ) دە هات بۆ لاى ، فيرى قورئانى پيرۆزى دەكرد ، جا له كاتەدا له هەموو كاتيكى تر زياتر خيرى دەكردو شتى دەبەخشى ، جبريلش ( عليه السلام ) دەستوورى وابوو له مانگى ڕمەزان دا هەتا مانگ تەواو دەبوو ،هەموو شەويك دەهات بۆ خزمەتى فيرى قورئانى دەكرد ، هە تاكو بەباشى ڕەوانى فيرى دەكرد بۆ ئەوەى له بيرى نه چيتەوە ، له ماوەى هاتنى جبريل ( عليه السلام ) دا بۆ ئەمە ئەوەندە خيرا بوو ، به هەر چوار لا دا شتى دەبەخشى ، دەلى باى هەلگراوە ،سۆزەى به هەموو لايە كا دە گات ..!!

[١٣٥] صحيح البخاري برقم (٣٢٢٠)، ومسلم برقم (٢٤٥٠).

✍( ١٣٦ )-عن ابن عباس رضي الله عنهما أن أبا سفيان رضي الله عنه أخبره من فيه إلى فيه قال:

انْطَلَقْتُ في المُدَّةِ الَّتي كَانَتْ بَيْني وبيْنَ رَسولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ، قالَ: فَبيْنَا أَنَا بالشَّامِ إذْ جِيءَ بكِتَابٍ من رَسولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ إلى هِرَقْلَ يَعْني عَظِيمَ الرُّومِ، قالَ: وكانَ دَحْيَةُ الكَلْبِيُّ جاءَ به، فَدَفَعَهُ إلى عَظِيمِ بُصْرَى، فَدَفَعَهُ عَظِيمُ بُصْرَى إلى هِرَقْلَ، فَقالَ هِرَقْلُ: هلْ هَاهُنَا أَحَدٌ مِن قَوْمِ هذا الرَّجُلِ الذي يَزْعُمُ أنَّهُ نَبِيٌّ؟ قالوا: نَعَمْ، قالَ: فَدُعِيتُ في نَفَرٍ مِن قُرَيْشٍ، فَدَخَلْنَا علَى هِرَقْلَ، فأجْلَسَنَا بيْنَ يَدَيْهِ، فَقالَ: أَيُّكُمْ أَقْرَبُ نَسَبًا مِن هذا الرَّجُلِ الذي يَزْعُمُ أنَّهُ نَبِيٌّ؟ فَقالَ أَبُو سُفْيَانَ: فَقُلتُ: أَنَا، فأجْلَسُونِي بيْنَ يَدَيْهِ، وَأَجْلَسُوا أَصْحَابِي خَلْفِي، ثُمَّ دَعَا بتَرْجُمَانِهِ، فَقالَ له: قُلْ لهمْ إنِّي سَائِلٌ هذا عَنِ الرَّجُلِ الذي يَزْعُمُ أنَّهُ نَبِيٌّ، فإنْ كَذَبَنِي فَكَذِّبُوهُ، قالَ: فَقالَ أَبُو سُفْيَانَ: وَايْمُ اللهِ، لَوْلَا مَخَافَةُ أَنْ يُؤْثَرَ عَلَيَّ الكَذِبُ لَكَذَبْتُ، ثُمَّ قالَ لِتَرْجُمَانِهِ: سَلْهُ كيفَ حَسَبُهُ فِيكُمْ، قالَ: قُلتُ: هو فِينَا ذُو حَسَبٍ، قالَ: فَهلْ كانَ مِن آبَائِهِ مَلِكٌ؟ قُلتُ: لَا، قالَ: فَهلْ كُنْتُمْ تَتَّهِمُونَهُ بالكَذِبِ قَبْلَ أَنْ يَقُولَ ما قالَ؟ قُلتُ: لَا، قالَ: وَمَن يَتَّبِعُهُ؟ أَشْرَافُ النَّاسِ أَمْ ضُعَفَاؤُهُمْ؟ قالَ: قُلتُ: بَلْ ضُعَفَاؤُهُمْ، قالَ: أَيَزِيدُونَ أَمْ يَنْقُصُونَ؟ قالَ: قُلتُ: لَا، بَلْ يَزِيدُونَ، قالَ: هلْ يَرْتَدُّ أَحَدٌ منهمْ عن دِينِهِ بَعْدَ أَنْ يَدْخُلَ فيه سَخْطَةً له؟ قالَ: قُلتُ: لَا، قالَ: فَهلْ قَاتَلْتُمُوهُ؟ قُلتُ: نَعَمْ، قالَ: فَكيفَ كانَ قِتَالُكُمْ إيَّاهُ؟ قالَ: قُلتُ: تَكُونُ الحَرْبُ بيْنَنَا وبيْنَهُ سِجَالًا يُصِيبُ مِنَّا ونُصِيبُ منه، قالَ: فَهلْ يَغْدِرُ؟ قُلتُ: لَا، وَنَحْنُ منه في مُدَّةٍ لا نَدْرِي ما هو صَانِعٌ فِيهَا. قالَ: فَوَاللَّهِ ما أَمْكَنَنِي مِن كَلِمَةٍ أُدْخِلُ فِيهَا شيئًا غيرَ هذِه. قالَ: فَهلْ قالَ هذا القَوْلَ أَحَدٌ قَبْلَهُ؟ قالَ: قُلتُ: لَا، قالَ لِتَرْجُمَانِهِ: قُلْ له إنِّي سَأَلْتُكَ عن حَسَبِهِ، فَزَعَمْتَ أنَّهُ فِيكُمْ ذُو حَسَبٍ، وَكَذلكَ الرُّسُلُ تُبْعَثُ في أَحْسَابِ قَوْمِهَا، وَسَأَلْتُكَ: هلْ كانَ في آبَائِهِ مَلِكٌ، فَزَعَمْتَ أَنْ لَا، فَقُلتُ: لو كانَ مِن آبَائِهِ مَلِكٌ قُلتُ رَجُلٌ يَطْلُبُ مُلْكَ آبَائِهِ، وَسَأَلْتُكَ عن أَتْبَاعِهِ أَضُعَفَاؤُهُمْ أَمْ أَشْرَافُهُمْ، فَقُلْتَ: بَلْ ضُعَفَاؤُهُمْ وَهُمْ أَتْبَاعُ الرُّسُلِ، وَسَأَلْتُكَ: هلْ كُنْتُمْ تَتَّهِمُونَهُ بالكَذِبِ قَبْلَ أَنْ يَقُولَ

ما قالَ؟ فَزَعَمْتَ أَنْ لَا، فقَدْ عرَفْتُ أنَّهُ لَمْ يَكُنْ لِيدَعَ الكَذِبَ على النَّاسِ، ثُمَّ يَذْهَبَ فَيَكْذِبَ على اللهِ، وَسَأَلْتُكَ: هل يَرْتَدُّ أَحدٌ منهمْ عن دِينِه بَعْدَ أَنْ يَدْخُلَهُ سَخْطَةً له؟ فَزَعَمْتَ أَنْ لَا، وَكَذلكَ الإيمانُ إذَا خَالَطَ بَشَاشَةَ القُلُوبِ، وَسَأَلْتُكَ: هلْ يَزِيدُونَ، أَوْ يَنْقُصُونَ؟ فَزَعَمْتَ أنَّهُمْ يَزِيدُونَ، وَكَذلكَ الإيمَانُ حتَّى يَتِمَّ، وَسَأَلْتُكَ: هلْ قَاتَلْتُمُوهُ؟ فَزَعَمْتَ أنَّكُمْ قدْ قَاتَلْتُمُوهُ فَتَكُونُ الحَرْبُ بيْنَكُمْ وبيْنَهُ سِجَالًا يَنَالُ منكُم وَتَنَالُونَ منه، وكَذلكَ الرُّسُلُ تُبْتَلَى ثُمَّ تَكُونُ لهمُ العَاقِبَةُ، وَسَأَلْتُكَ: هلْ يَغْدِرُ؟ فَزَعَمْتَ أنَّهُ لا يَغْدِرُ، وكَذلكَ الرُّسُلُ لا تَغْدِرُ، وَسَأَلْتُكَ: هلْ قالَ هذا القَوْلَ أَحدٌ قَبْلَهُ؟ فَزَعَمْتَ أَنْ لا فَقُلتُ: لَو قالَ هذا القَوْلَ أَحدٌ قَبْلَهُ قُلتُ رَجُلٌ ائْتَمَّ بقَوْلٍ قيلَ قَبْلَهُ، قالَ: ثُمَّ قالَ: بمَ يَأْمُرُكُمْ؟ قُلتُ: يَأْمُرُنَا بالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ والصِّلَةِ وَالْعَفَافِ، قالَ: إنْ يَكُنْ ما تَقُولُ فيه حَقًّا فإنَّه نَبِيٌّ، وقَدْ كُنْتُ أَعْلَمُ أنَّهُ خَارِجٌ، وَلَمْ أَكُنْ أَظُنُّهُ مِنكُمْ، ولو أَنِّي أَعلَمُ أَنِّي أَخْلُصُ إلَيْهِ لَأَحْبَبْتُ لِقَاءَهُ، ولو كُنْتُ عِنْدَهُ لَغَسَلْتُ عن قَدَمَيْهِ، وَلَيَبْلُغَنَّ مُلْكُهُ ما تَحْتَ قَدَمَيَّ. قالَ: ثُمَّ دَعَا بكِتَابِ رَسولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ، فَقَرَأَهُ فَإِذَا فيه بسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، مِن مُحَمَّدٍ رَسولِ اللهِ إلى هِرَقْلَ عَظِيمِ الرُّومِ، سَلَامٌ علَى مَنِ اتَّبَعَ الهُدَى، أَمَّا بَعْدُ، فَإِنِّي أَدْعُوكَ بدِعَايَةِ الإسْلَامِ أَسْلِمْ تَسْلَمْ، وَأَسْلِمْ يُؤْتِكَ اللَّهُ أَجْرَكَ مَرَّتَيْنِ، وإنْ تَوَلَّيْتَ فإنَّ عَلَيْكَ إثْمَ الأرِيسِيِّينَ، و{يَا أَهْلَ الكِتَابِ تَعَالَوْا إلى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بيْنَنَا وبيْنَكُمْ أَنْ لا نَعْبُدَ إلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ به شيئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِن دُونِ اللهِ فإنْ تَوَلَّوْا فَقُولوا اشْهَدُوا بأنَّا مُسْلِمُونَ} فَلَمَّا فَرَغَ مِن قِرَاءَةِ الكِتَابِ ارْتَفَعَتِ الأصْوَاتُ عِنْدَهُ وَكَثُرَ اللَّغْطُ، وَأَمَرَ بنَا فَأُخْرِجْنَا، قالَ، فَقُلتُ لأَصْحَابِي حِينَ خَرَجْنَا: لقَدْ أَمِرَ أَمْرُ ابْنِ أَبِي كَبْشَةَ، إنَّه لَيَخَافُهُ مَلِكُ بَنِي الأصْفَرِ. قالَ: فَما زِلْتُ مُوقِنًا بأَمْرِ رَسولِ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ أنَّهُ سَيَظْهَرُ، حتَّى أَدْخَلَ اللَّهُ عَلَيَّ الإسْلَامَ. وفي رواية: بهذا الإسْنَادِ. وَزَادَ في الحَديثِ، وَكانَ قَيْصَرُ لَمَّا كَشَفَ اللَّهُ عنْه جُنُودَ فَارِسَ مَشَى مِن حِمْصَ إلى إيلِيَاءَ شُكْرًا لِما أَبْلَاهُ اللَّهُ، وَقالَ في الحَديثِ: مِن مُحَمَّدٍ عبدِ اللهِ وَرَسولِهِ، وَقالَ: إثْمَ اليَرِيسِيِّينَ، وَقالَ: بدَاعِيَةِ الإسْلَامِ)).[136]

[136] صحيح مسلم برقم (١٧٧٣) و صحيح البخاري برقم (٧) ، تاج جامع الاصول في الاحاديث الرسول ﷺ (٩٣/٢) برقم (٣٦).

واته : له عبدالله ی کوری عباس ﷺ، ده گیرته‌وه ده‌لیت : (ابو سفیان کوری حرب ) ﷺ به زمانی خۆی بۆی گیرامه‌وه ووتی : له کاتی ریکه وتنی یان په یمانی حودیبه دا ، که له نیوان من پیغه‌مبه‌ری خوا ﷺ کرا بوو ، منیش چووم بۆ شام له کاته دا که من له شام بووم ، له کۆتایی سالی شه‌شه‌می کۆچیدا ، (دیحیه کوری که‌لب ) نامه‌یه‌کی هینا له پیغه‌مبه‌ری خوا ﷺ که لی نووسرا بوو بۆ قه‌یصه‌ری رۆما که هیرقل بوو پاشای رۆما ، دیحیه‌ی کوری که‌لب ) نامه‌که‌ی یان غاغه‌زه‌که‌ی پیغه‌مبه‌ری خوا ﷺ دایه ده‌ست سه‌رداری بوصرا یان پاشای بوصرا که سه‌ر به رۆمه‌کان بوو ،سه‌رداری بوصرا دایه ده‌ستی هیرقل خۆی ، ئا له‌م کاته‌دا هیرقل سوپای فارس دابووی به‌سه‌ری داو ته‌نگی پی هه‌لچنی بوو ، که شام و هه‌موو ده‌روبه‌ری تا جزیره‌و گه‌لی وه‌لاتی تری لی دا گیر کردبوو ، هیرقل خۆی په‌نای بردبوو بۆ وه‌لاتی قوستنتنیه ، واته: (استنبولی ئیستا ) له‌ویشدا ماوه‌یه‌کی دوورو دریژ گه‌مارۆی دابوو ، ئه‌وه بوو ، که (خوای گه‌وره ) سوپای فارسی له کۆل کرده‌وه ، هیرقل بۆ سوپاس کردنی (خوای گه‌وره ) ئه‌و به‌لا گه‌وره‌یه‌ی سوپای فارس ، نزری کرد ، که به پییان له شاری حمصی سوریا بچیت بۆ شاری قدسی مه‌لبه‌ندی پیغه‌مبه‌ران (علیه السلام ) هه‌روه‌ها له یه‌کیك له گیرانه‌وه کاندا له (زوهری ) که ده گیریته‌وه ده‌لیت : له شاری حمصی سوریا تاکو شاری قدسی فه‌له‌ستین ، فه‌رش و مافوریان بۆ راخست بوو ، وه به گول ریحان پیشوازیان لی کردبوو ، تا بیته بۆ شاری قدسی فه‌لستین ، یان تاکو بیت مقدیس ، جاکاتی نامه‌که‌ی پیغه‌مبه‌ری خوا ﷺ پی گه‌یشت له شاری قدس یان بیت مقدیس ، هیرقل ده‌لی : ئاده‌ی بگه‌رین به دوای که سیك دا که لیره‌دا بیت و بزانن که‌سی هه‌یه که له هۆزی یان له نه‌وه‌ی ئه‌م پیاوه بی که ئه‌م نامه‌یه ی بۆ من نووسیوه و خۆی به پیغه‌مبه‌ر ده‌زانی ..؟! ووتیان : به‌لی . ابو سفیان ده گیرته‌وه ده‌لیت : من و چه‌ند که‌سیك له هۆزی قریشیان بانگ کرد ، که نزیکه‌ی (٣٠ ) پیاو ده بووین ،چووینه ژووره‌وه بۆ لای هیرقل پاشای رۆما ، له‌به‌رده‌م هیرقل دانیشتین ، هیرقل له‌سه‌ر ته‌ختی

پاشایەتی دانیشتبوو ، تاجی پاشایەتی لە سەردا بوو ،گەورە پیاوانی رۆما قەشە و بەتریق راهیب کەسانی زۆری لە دەورە دا بوو ، هیرقل ووتی : کامە پیاوتان لە پیغەمبەرە بەخزمایەتی نزیکن ، گوایە کە خۆی بە پیغەمبەر دە زانی کامە تان لی نزیکترە ..؟! ابو سفیان ووتی : منیش ووتم : من . ئیتر منیان لە پیش خۆی دانیشاند و ،وە هاوریکانیمان لە پشتمەوە دانیشاند ،ئینجا ترجمەنیکیان هینا یان زمان زانیکیان هینا ،هیرقل ووتی : پیان بلی : ئەوا من لەو پیاوە پرسیار دەکەم هەوالی ئەو پیاوەی لی دەپرسم کە دەلی من پیغەمبەرم ، جا ئەگەر ئەم لەو بارەیەوە بەدرۆ وەلامی منی دایەوە ئیوە بەدرۆی بخەنەوە . ابوسفیان ووتی : بەخوا لەبەر ئەوە نەبوایە کە پیم شەرم بوو ،درۆم لی بەدرە دەکەویت ، ئەگینا ئەو رۆژە درۆم دەکرد و قەیصەرم چەواشە دەکرد ، لە بارەی هەوای پیغەمبەرەوە ﷺ ، چونکە ئەو سەردەمە من و پیغەمبەر ﷺ هاوداوی یەکتر بووین ، ئینجا هیرقل بە ترجومەنەکەی ووت : لی بپرسە : بنەچەو رەسەنی لە ناو تاندا چۆنە ..؟! خانە دانە یان نا ..؟! ابو سفیان ئەلیت ووتم : تا بەلی خانەدان و میوان دۆست و وجاخزادیە ..!! هیرقل ووتی : باشە ئایا لە ناو باو باپیرایا پادشایان لە ناو هە لکەو تووە ؟!

ابو سفیان : ووتی : نەخیر . هیرقل ووتی : باشە ئەم پیاوە لە پیش ئەوە دا کەبلی من پیغەمبەرم درۆتان لی دیوە ..؟!

ابو سفیان دەلی : ووتم : نەخیر .

هیرقل ووتی : باشە ئەوانەی کە شوینکەوتووی ئەو پیغەمبەران یان دەچنە سەر ئاینی ئەو لە پیاو ماقول و خانەدانەکانن یان لە خلکەی لاوازە کان هەژارەکان و بی نەواکانن ..؟!

ابو سفیان ووتی : ووتم : نەخێر ، هەر لە لاوازەکان هەژارە کان و بینەواکانن شوێنکەوتووی ئەو پێغەمبەرە .!! 

هیرقل ووتی: باشە ئەوان زیاد دەکەن یان بەرە بەرە کەم دەکەن ..؟!! 

ابو سفیان ووتی :ووتم : نەخێر . بەلکو ڕۆژ بەرۆژ زیاد دەکەن زۆر دەبن ..!! 

هیرقل ووتی : باشە کەس هەیە لەوانەی کە دەچنە سەر ئەو ئاینەی ئەو لە پاشاندا لی بیزاربی پاشگەز ببیتەوە هەلگەڕیتەوە واز لە ئاینە بهێنی ..؟! 

ابو سفیان ووتی : ووتم : نەخێر . بەلکو دامەزراو تر دەبێت ..!! 

هیرقل ووتی : ئەی جەنگتان لەگەلدا کردووە ..؟! 

ابو سیفان ووتی :ووتم : بەلی . 

هیرقل ووتی : ئەی جەنگ و شەر کردن چۆنە لە گەلتاندا ..؟! 

ابوسفیان ووتی :ووتم : جەنگ و شەرکردن لە نیوا نماندا بە نۆرەیە ..!! جاری وا هەیە ئەو زال دە بیت و سەردەکەویت بەسەرماندا ،جاری واش هەیە ئیمە زال دەبین بەسەر ئەواندا ..!! 

هیرقل: ووتی : باشە ، ئەی پە یمان دەشکینی یان نا ..؟! 

ابو سفیان ووتی : ووتم : تائیستا هیچ پە یمانیکی نەشکاندووە ، وە ئیستاش پە یمانیکان لە نیوان دایە مەبەستی صولحی حودیبیە بوو ، ریکەوتین لەسەر جەنگ نەکردن ، بۆماویەك جا نازانین دەی باتەسەر یان نا ..!! 

ابو سفيان ووتی ووتم : بەخودا تەنها ئەو ووشەيە نەبيت مەودای تر نادەم ..!!

هيرقل : ووتی : باشە ئەی كەسی تر لە پيش ئەمەوە قسەی وای كردووە لە ناو تاندا..؟!ئينجا بە ترجمەنەكە ی خۆی ووت : پی بلی . كەمن ليم پرسی : دەربارەيە نسب حسب بنەچە و رەسەنی ئەو پياوە وە.. !! تۆ وەلامت دايەوە ووت: هەتا بلی ،خانەدانە و وجاخزادەيە لە ناوماندا ، ئەويش ئاداب و نەريتی هەموو پيغەمبەرای بووە ، هەموويان وانە ، هەموو كاتی ( خوای گەورە ) كەسيكی خانەدان و وەجاخزادەی هەلبژاردووە و كردوويەتی بە پيغەمبەر و نارووبەتی بۆ سەر قەوم و هۆزەكەی خۆی ، هيرقل ووتی: ليشم پرسی : دەربارەی ئەوەی ئايا باو باپيرای ئەم پياوە پاشايان تيدا بووە يان نا ..؟! تۆ ووتت : نەخير . هيرقل ئەلی : منيش لە دلی خۆم ووتم : ئەگەر باوك و باپيرانی پاشا بوايە دە م ووت : پياويكە بەدوای دەستهەلات و فەرمانرەوايی مولك و مالی باوك و باپيری يەوەيەتی . هيرقل دەلی : پرسياريشم لی كردی ئايا شوينكەوتوانی ئەوپياوە لە خەلكی پياوماقول خانەانەكان و يان لە خەلكی رەش و رووت هەژارو لاوازەكان وبی نەوايان شوينكەوتووين ..؟! ئەوە بوو تۆش ووتت : نەخير ، لاوازو هەژارو شەرو رووت بی نەواكان شوينكەوتووين ..!! هيرقل ئەلی : لە راستی دا هەموو شوينكەوتوانی پيغەمبەران زۆربەی لە جۆرە خەلكانەن كە لاوازو هەژارو بی نەواكانن ..!! هيرقل ئەلی : ليشم پرسی ئايا لە پيش ئەوەدا كە بلی من پيغەمبەرم درۆتان لی ديووە ..؟! تۆ ووت : نەخير . منيش ووتم : چۆن دەبی لە گەل خەلكا درۆنەكا ،بەلام لە پاشاندا بچی درۆ لە گەل خودا بكات شتی وا نابی ..!! هيرقل ئەلی : من لە تۆم پرسی ..؟! ئايا كەسی هەيە لە شوينكەوتوانی كە شارە زای ئاينەكەی ئەو بيت و ، لە پاشاندا پاشگەز بيتەوە ..؟! تۆش ووت : نەخير .

هیرقل ووتی : لەراستی دا کاتی دل خۆشی ئیمان و باوەر بچیژی و تام چیژی لی وەر بگری ئیتر هەتا هەتایە ئەو فینکی ئیمان وباوەر لە و دلە ئارمە دەرناچی و دامەزارو دەبی ،دەبن بەگول و بولبول ،

هیرقل دەلی : من لە تۆم پرسی : ئایا شوینکەو توانی زیاد دەکەن یان کەم دەکەن ؟!!

تۆش ووتت: تادی زۆر دەبەن ..!! هەموو ئاین و بیروباوەریکی دروست ئاوایە ، هەرکە لە زیاد بوونە هەتا لە ئەنجام ما سەردەگری و تەواو دەبی ..!!

هیرقل : ئەلی : من لە تۆم پرسی :ئایا شەرو جەنگتان لەگەل دا کردووە ، تۆش ووتت : جەنگ وشەرمان لە نیواندا کردووە تائیستا جەنگی نیوامان دووبەختی بووە ،جاری ئەو دەییاتەوە جاری ئیمە دەی بینەوە ،هیرقل ووتی : لە راستیدا ئەوە رەوشتی هەمووپیغەمبەری بووە ، لە سەرەتادا تاقی دە کرینەوە و دووچاری هیلاکی ئیش وئازار دەبن ، بەلام ئەلە ئە نجامدا ئەوان سەردەکەون وکە رۆژ هەلات بەرەبەرە سوپای زۆر و ستەم ناحەقی ئاودەکریتە ژیری و گولولەی دەکەویتە لیژی ،

هیرقل ووتی : من لەتۆم پرسی : ئایا پەیمان دەشکینی یان نا ..؟!! تۆش ووت : خاوەن پەیمانەو پەیمان ناشکینی ، ئەمەش شیوەو رفتاری هەموو پیغەمبەرانە ،چۆنکە پیغەمبەران (علیه السلام ) هەرگیز پەیمان ناشکینن و بەلین دەبەنەسەر ،

هیرقل دەلی : من لە تۆم پرسی : ئای کەسیکی تر لەپیش ئەو دا ئەمەقسەیەی کردووە لە ناو تاندا کە بلی من پیغەمبەری خوام ..!! تۆش ووتت : نە خیر .

هیرقل ئەلی : منیش لە دلی خۆمندا ووتم : ئەگەر کەسیکی تر لە پیش ئەو دا ئەم قسەیەی ووت بایە دەم ووت : ئەم پیاوەش لاسایی ئەو قسەکۆنە یە دەکاتەوە ..!!

ابو سفیان ووتی : ئینجا هیرقل ووتی : فەرمانتان بەچی پی دەکا؟ دەلی چی بکەن؟ چی مەکەن ؟ ابو سفیان ووتی منیش ووتم : پیان دەلی : نویژ بکەن و زەکات بدەن خزم دۆست بن ، بۆ خزمان باش بن و مافی خزمایەتی بەجی بهینن ، دەست پاك بن ، داوین پاك بن ،دەم ودلپاك بن ، بە ندەی چاك و ساغ بن بۆ ( خوای گەورە ) هیچ شتیك نەكەن بە هاوەل بۆ خودا ، واز لە بت پەرستی خودا درۆینە كان بهیننن ، كە باو باپیران لە جایلی دا یان لە كۆندا دەیان پەرستن ..!!

هەروەها هیرقل ووتی : ئەوەی تۆ دەلی : دەربارەی ئەو پیاوە ئەگەر راست دروست بیت و ئاوابی ، ئەوە ئەو پیاوە پیغەمبەری خودایە ، منیش دەمزانی كە ئەو پیغەمبەرە بە زووی پەیدا دەبیت و دی ، بەلام نەمدەزانی كەلە ئیوە یە پەیدا دەبیت دی ، هەروەها هیرقل ووتی : ئەی كۆمەلی عەرەب ..!! وە من بەس بەحالی خۆم ئەگەر بزانم رزگار دەبم و دەگەمەلای حەز دەكەم بچم بۆ خزمەتی ، ئەگەر لەلای دە بووم لاقە كانیم دەشۆرد ، هەروەها هیرقل ووتی : سویند بەخودا قەلەمڕەوی فەرمانرەوای ئەو پیاوە دەگاتە ئەوشینەی منیش واتە ئەوشوینە ژیر فەرمانرەوایی منیش ،هەرواش بوو ..!! هیرقل ووتی : خاكی بیت مقدس هەموو وەلاتی شام فتح دەكات ، هەرواش بوو لە سەردەمی عمری كوری ختاب فتح كرا ..!!

ابو سفیان ووتی : هیرقل لە پاشاندا دوای نامەكەی پیەمبەری خوای ﷺ كردو خویندیەوە ، ناوە رۆكی نامەكەی پیغەمبەری خوا ﷺ ئەمە بوو :

بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان ، لە ﷴ كە بەندەی خودایە ، كە پیغەمبەری خوادیە ، بۆلای هیرقل مەزنی رۆم ، سلاو دروود لە پەیرەوانی ریگەی راستی ، یان سلاو لەراستی خوازان ، لە پاش ئەمە من دوات لی دەكەم كە ئیسلام ببیت ،ئیسلام ببە لە هەردوو جیهان دا سەلامەت دەبیت ،ئیسلام ببە خودا لەباتی جاری دووجاری پاداشت دەداتی ،چونكە هەموو خاوەن نامەیەكی نۆی موسلمان دووپاداشتی بۆ هەیە ،سەرەرای ئەوەش كە دەبی بە مامۆستای ری نیشاندەر ی خیر بۆ هەموو دەست و پەیوەندەكەی

خۆت و دەبی بەسەر مەشق بۆ یان ، ئەگەر سەرپیچیش دەکەی نابیتە ئیسلام ئەوا بزانە کە هەم ئۆبال و گوناهی خوت و هەم ئۆبال گونای خەلکی هەژارو گوناهو پیاو ماقول و وەزیرەکانیش لە ئەستۆی تۆیە ، چونکە ئەوانە لەژیر دەست هەلاتی تۆن و چاویان لەدەمی تۆیە ، هەروەها دوات لی دەکەم بەهۆی ئەم ئایەتەیشەوە کە ( خوای گەورە ) دەفەرموویت : ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ ال عمران ٦٤ .

هەروەها ابوسفیان ووتی : کاتی هیرقل لە خویندنەوەی نامەکەی پیغەمبەری خوا ﷺ تەواو بوو ، لە دەرەوە بووە بە دەنگە دەنگ قاژو قیژو چرپە چرپ هەرایانایەوە ، ئیتر دەستوور درا ئیمە کراینە دەروە ک، کە چووینە دەووە بە هاوریکانی خۆمم ووت : بەراستی خۆ کاری کورە کە ی ( ابو کبشە ) باوی شیری پیغەمبەرە ﷺ و میردی حلیمەیە کەدایەنی پیغەمبەری خوا ﷺ ئیتر هەر لە وکاتەوە من دەمزانی کارو باری پیغەمبەری خوا ﷺ سەردەکەوی و گومانم لەوەدا نەبوو ، تا ئەو رۆژەی خودای گەورە منی کردە بە موسلمان و چوومە سەر ئاینی ئیسلام ..!!

## باشترین سەردەم سەردەمی هاتنی پەیامی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە

(١٣٧) عن ابي هريرة رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال:

((بُعِثْتُ من خيرِ قُرونِ بَنِي آدَمَ قَرْنًا فقَرْنًا ، حتى كُنتُ من القَرْنِ الذي كُنتُ فِيه ))[137].

واتە: لە ابو هريرە رضي الله عنه دە گێرتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووی : سەردەم بە سەردەم بشت بە پشت بە پاکی و باشی هاتوومەتە خوارەوە باو باپیرم لە هەموو سەردەمیکدا لە باشترین چینی ئادەمیزادی ئەو سەردەمە بوون تا گەیشتوومەتە ئەم سەردەمەی خۆم کە خودا رەوانەی کردووم کردوومی بە پیغەمبەر یان نیگای بۆ رەوانە کردووم لە م سەردەمە دا ..!!

تیبینی / واتە: باشترین سەردەم ئەم سەردەمەیە لە هەموو سەردەمەکان کە لە سەردەمی ئادەمەوە تاکو سەردەمی هاتنی وحی نیگا دا ،باشترین سەردم و خێرترین سەردەم ،سەردەمی هاتنی وە حی یان نیگایە بۆ پیغەمبەری خوا ﷺ چونکە کۆتا پیغەمبەرە کۆتا کتابی ئاسمانیە ئەویش قورئانی پیرۆزە ..!!

---

[137] صحيح البخاري برقم (٣٥٥٧).

(١٣٨) عن ابي هريرة رضي الله عنه قال: أن رسول الله ﷺ قال:

(( أنا سَيِّدُ ولَدِ آدَمَ يَومَ القِيامَةِ، وأَوَّلُ مَن يَنْشَقُّ عنْه القَبْرُ، وأَوَّلُ شافِعٍ وأَوَّلُ مُشَفَّعٍ )). [138]

واتە: لە ابو هریره رضي الله عنه دە گێرتەوە دەڵێت : پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:

من سیدی نەوەی ئادەمم ، یەکەم کەسم کە زەویم بۆ شەق دەکرێت – واتە : زیندو دەکریمەوە لە گۆڕەکەم دیمەدەرەوە – یەکەم کەسم کە تکا دەکەم ، یەکەم کەسم تکام لی وەردەگیریت و قبول دەبیت ..!!

تیبینی / پیغەمبەرەی خوا ﷺ یەکەم کەسە کە لە نەوەی ئادەم یان لە دوای پیغەمبەرئادەم (علیه السلام) زیزو پلە و پایە یە پی بەخشراوە ، لە دوای ئادەم ئەو پلە و پایە بە کەس نەدراوە تەنها پیغەمبەری خوا ﷺ نەبیت ، کە سیدی هەموو مرۆڤایەتیە یەکیکە لە پیغەمبەرانی اول عزم ..!! چونکە گەورە ترین معجزیە و نیشانەکانی خوای گەورە کە بۆ پیغەمبەران هاتووە ، گەورە ترینیا قورئانی پیرۆزە .

[138] سنن ابي داود برقم (٤٦٧٠) .

(١٣٩) عن ابي هرير رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال:

((إنَّ مَثَلِي ومَثَلَ الأنْبِياءِ مِن قَبْلِي، كَمَثَلِ رَجُلٍ بَنَى بَيْتًا فأحْسَنَهُ وأَجْمَلَهُ، إلَّا مَوْضِعَ لَبِنَةٍ مِن زاوِيَةٍ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَطُوفُونَ به، ويَعْجَبُونَ له، ويقولونَ: هَلَّا وُضِعَتْ هذِه اللَّبِنَةُ؟ قالَ: فأنا اللَّبِنَةُ، وأنا خاتِمُ النَّبِيِّينَ)).[139]

واتە: لە ابو هريرە رضي الله عنه لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

پەیامی من و پەیامی هەموو پیغەمبەرەکانی پێش من وە ك پیاوی وایە ،کە خانوویەك دروست بکات لە هەموو لایەکانیەوە زۆر جوانی رازاوە بیت زۆر بەباشی دروست کرابیت ،بەلام تەنها شوینی یەك تاقە خشت نەبیت دروست نەکرابیت و لە گۆشەیەکی جۆل بی ، وە خەلك دەست دەستە بە ناو ئەم خانووە دا بسووڕینەوە و بلین : ئەم خانووە چەند جوان درست کراوە ..!! خۆزگە ئەم خشتەش لە سەر خشتەکانی تر دادەنرا ،ئەم بۆشایە یان چۆلی یە پردە کرایەوە ، دەی من ئەم خشتەو ئەم چۆل یە یان ئەم پرکردنەوەیە بووم بە بە کۆتا پیغەمبەر ئیتر لە پاش من پیغەمبەری تر نابی ..!!

[139] صحيح البخاري برقم (٣٥٣٥) و صحيح مسلمبرقم (٢٢٨٦).

## له پێغەمبەری خوایان پرسی کەی پێغەمبەرایەتی پی بەخشرا..؟!

(١٤٠)عن ابي هريرة ﷺ قال : قال رسول الله ﷺ :

((يا رسولَ اللهِ ! مَتى وجَبت لكَ النُّبوَّةُ ؟ قال : وآدمُ بين الرُّوحِ والجسَدِ)).[١٤٠]

واتە : لە ابو هريرە ﷺ دە گێرتەوە دەڵیت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ پرسی : ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەی پێغەمبەرایەتیت پی بەخشرا و جیگیر بوو .؟!

ئەویش فەرمووی : هیشتا ئادەم (علیه السلام ) لە جستە بوو ڕووحی نەخرابووە بەری..!!

تێبینی / پیش ڕوو بە بەر ئادەم بیت پیغەمبەر ﷺ پیغەمبەرایەتی پی بەخشرا لەلایەن پەروەردگاری هەموو جیهانیان ، کە پیش هاتنە خوارەوەی ئادەم بۆ خلیفە ی سەر زەوی ئەوە بوو پیغەمبەرایەتی یان پەیمایی خوایی بەخشرا بە پیغەمبەری خوا ﷺ کە کۆتا پیغەمبەرە لە دوای ئەو هیچ پیغەمبەریك یان هیچ پەیامیکی خوایە نایەت و کۆتایی پیغەمبەرانە و کۆتا کتابی ئاسمانیە ئەو پەیمای خوای گەورە کە قورئانە پیرۆزە ، کە ئەم قورئانەبۆ هەموو مرۆڤەکان و جنۆکە لەسەر زەوی ئاسمان دا هاتووە ..!!

---

[١٤٠] الترمذي برقم (٣٦٠٩)

## لەرۆژی قیامەت دا بەرزترین نەوەی ئادەم پیغەمبەری خوایە ﷺ

**(١٤١) عن أنس بن مالك رضي الله عنه قال : قال رسو ل الله ﷺ :**

**((أنا أوَّلُ النَّاسِ خروجًا إذا بُعِثوا ، وأنا خَطيبُهُم إذا وفَدوا، وأنا مُبشِّرُهُم إذا أيِسوا، لِواءُ الحَمدِ يومَئذٍ بيدي، وأنا أكْرَمُ ولدِ آدمَ علَى ربِّي ولا فَخرَ)).** [١٤١]

**واتە : لە انسی کوری مالك رضي الله عنه دەگێریتەوە لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :**

**کاتی خەلك لە رۆژی قیامەت دا زیندوو دەبنەوە ،من یەکەم کەسم لە قبر زیندوو دەکریمەوە لە گۆردا دەردەچم ،کاتی دە رۆن بۆ خزمەت پەروەردگاریان ،من قەسە کەر یان ووتەبیژی خەلك دەبم ،کاتی نائومید دەبم من مووژدە دەری خۆشیان دەبم و دلیان خۆش دەکەم ، لە کاتەدا ئالای سوپاس گوزاری بەدەستەمە منە وەیە ..!! لەو رۆژە دا من بەرزترین نەوەی ئادەمم ، بەلام بە فەخر نەبیت ..!!**

**تیبینی : کە دەلیت : بە فخر نەبیت ، بە واتای فخرو شانازی ناکات بە خۆیەوە ، چونکە ئەوە نیعمەتیکی خوایە ، کە (خوای گەورە ) بیەویت بە هەر کەسیکی دەبەخشیت لە ناو هەموو مرۆڤایەتی دا لە نەوەی ئادەمیزاد بە خشیەتی بە پیغەمبەری خوا ﷺ کە بە بەرزترین پلە ئەو ریزو پایەیە پی بەخشیوە ..!!**

---

[١٤١] سنن الترمذي برقم (٣٦١٠) حديث حسن غريب.

(١٤٢) عن ابي هريرة رضي الله عنه قال : قال رسول الله ﷺ :

((أَنَا أَوَّلُ مَنْ تَنْشَقُّ عَنْهُ الْأَرْضُ ، فَأُكْسَى الْحُلَّةً مِنْ حُلَلِ الْجَنَّةِ ، ثُمَّ أَقُومُ عَنْ يَمِينِ الْعَرْشِ لَيْسَ أَحَدٌ مِنَ الْخَلَائِقِ يَقُومُ ذَلِكَ الْمَقَامَ غَيْرِي)). [١٤٢]

واتە: لە ابی هریرە رضي الله عنه دەگێرتەوە دەلێت : پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من یەکەم کەسم زەویم بۆ شەق دەکریت و زیندوو دەکریمەوە ،وە جل وبەر گیک لە جل وبەرگەکانی بەهەشتم لە بەر دەکریت ، لە پاشاندا لە لای راستی عەرشی (خوای گەورە ) رادەوەستم ،جگە لە من هیچ کەسی لە دروست کراوان ئەو شە رەفەی پی نادیریت وە ناگاتە ئەو پلە و پایە !

تیبینی / لە لای راستی عەرشی پەروەردگار ، ئەوە گەورەیی و مەزنەیەتی پلە پایە ی پیغەمبەری خوایە پی بە خشراوە لە لایەن (خوای گەورە ) بەکەسی تری نەبەخشیوە ..!!

[١٤٢] سنن الترمذي برقم (٣٦١٢) حديث حسن غريب .

✍(١٤٣)عن ابن عباس رضي الله عنه قال:

(( جلَسَ ناسٌ مِن أصحابِ رسولِ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ ، ينتَظِرونَهُ ، قالَ : فخَرجَ حتَّى إذا دَنا منهم سمعَهُم يتذاكرون فسمِعَ حديثَهُم، فقالَ بَعضُهُم: عجبًا إنَّ اللَّهَ اتَّخذَ من خلقِهِ خليلًا، اتَّخذَ من إبراهيمَ خليلًا، وقالَ آخرُ: ماذا بأعجَبَ مِن كلامِ موسى كلَّمَهُ تَكْليمًا، وقالَ آخرُ: فَعيسى كلمةُ اللَّهِ وروحُهُ، وقالَ آخرُ: آدمُ اصطفاهُ اللَّهُ. فخرجَ عليهِم فسلَّمَ وقالَ: قد سَمِعْتُ كلامَكُم وعجبَكُم إنَّ إبراهيمَ خليلُ اللَّهِ وَهوَ كذلِكَ وموسى نجيُّ اللَّهِ وَهوَ كذلِكَ، وعيسى روحُهُ وَكَلمتُهُ وَهوَ كذلِكَ وآدمُ اصطفاهُ اللَّهُ وَهوَ كذلِكَ، ألا وأَنا حبيبُ اللَّهِ ولا فخرَ، وأَنا حاملُ لواءِ الحمدِ يومَ القيامةِ ولا فخرَ، وأَنا أوَّلُ شافعٍ وأوَّلُ مشفَّعٍ يومَ القيامةِ ولا فخرَ، وأَنا أوَّلُ من يحرِّكُ حلقَ الجنَّةِ فيفتحُ اللَّهُ لي فيدخلُنيها ومعي فقراءُ المؤمنينَ ولا فخرَ، وأَنا أَكْرمُ الأوَّلينَ والآخرينَ ولا فخرَ )).[١٤٣]

[١٤٣] سنن الترمذي برقم (٣٦١٦) حديث غريب .

واتە : لە کوری عباسە وە ﷺ دە گیریتەوە دەلیت : هاوەلانی پیغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوون چاوەری پیغەمبەری خوا یان ﷺ دەکرد ، ئەویش لە مال دەرچوو هەتا کو نزیك بوویەوە لە هاوەلانی ، گویی لە قسەو باسە کانیان بوو ،هەندیکیان دە یان ووت : سەیرە ..!! ( خوای گەورە ) کی لە دورستکراوانی خۆی کردۆتە دۆست خۆشەویستی خۆی یان خلیلی خۆی کە (إبراهیم ) (علیە اسلام ) مە کە دۆستی و خۆشەویستی خۆیە تی ، یەکیکی تر لە نیو دانیشتنەکەدا ووتی : سەیرە تر ..!! چی بی (خوای گەورە ) راستە و خۆ قسەی لە گەل موسا (علیە السلام ) دا کردووە ..!! یەکیکی تریش لە دانیشتنەکەدا ووتی : عیسا (علیە السلام ) رووحیکی پاکەو لە لایەن (خوای گەورە ) وە بە یەك ووشە پەیدا بووە ..!! هەروەها لەدانیشتنەکەدا یەکیکی تریان ووتی : (خوای گەورە ) ئادەمی بە دانسقە هەلبژاردووە ، پیغەمبەری خوا ﷺ چووە ناویان سلاوی لی کردن فەرمووی : بی گومان من گویم لە قسە کانتان بوو ،(خوای گەورە ) ابراهیم (علیە السلام ) کردۆتە دۆست خۆشەویستی خۆی ، هەروەها (خوای گەورە ) راستە خۆ قسەی لەگەل موسا (علیە السلام ) کردووە ، وە (خوای گەورە ) عیسای (علیە السلام ) لە رووحیکی پاك لە لایەن خۆیەوە بەیەك ووشە پەیدا بووە ، (خوای گەورە ) ئادەمی (علیە السلام ) بە دانسقە هەبژاردووە ، بەلی وایە ئەمانە هەر هەمووی حەق راستن ،بەلام ئاگادار بن بە فەخرو شانازی نەبی ،منیش خۆشەویستی (خوای گەورە )م لە رۆژی قیامەتدا ئالای سوپاس گوزاری بەدەست منەوەیە ،و یەکەم تکا کارم و یەکەم کەسیشم تاکام لی وەردەگیری ،و یەکەم ئەلقەی دەرگای بە هەشت رائەوشینم ،خوای گەورە دەرگا کانم بۆ دەکاتەوە و دەمباتە ناوی لە لەتك موسلمانە هەژارەکاندا سەروەر و بەریزترینی سەرتا و کۆتایی سەرجەم خەلکم ، واتە بەریز ترین لە سەرەتای نەوەی ئادەم بەریزترین لە کۆتای نەوەی ئادەم ..!!

# هەر ووتـاريك بەبى شايە تمان ئەمە بە ووتـار دانانريت ..؟!

✍(١٤٤) عن ابي هريرة رضي الله عنه قـال : قـال رسول الله ﷺ :

((كلُّ خُطبةٍ ليسَ فيها تشَهُّدٌ فَهيَ كاليدِ الجذماءِ)) [١٤٤].

واته : له ابو هريره رضي الله عنه ده گيرتەوه له پيغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويه تى :

هەر ووتـاريك كه شايه تمانى تيدا نەبيت ئەم ووتـاره به ووتـار هەژمار ناكريت

تيبينى / ووتـار دان لەسەر مينەبەر يان له نـاو كۆ رو دانيشتندا بيت يان هەر ووتـاريك كه بەندەى ئيمان دار دەرى دەبيت بۆ خەلك ده بيت شايه تمان بلى له سەره تـاى ووتـاره كەى دا ، بۆ ئەوه ى خۆى پابەندى ئەركانه كانى ئيسلام بكات به شەيتمان گويرايه لى خوا و پيغەمبەرى خوا ﷺ له فەرمانەكانى دا وه له قەدەغەكراوه كانى ، هەروەها شەيه تمانيش دووبـات كردنەوەى پەيمان و بەلينى بەندەى موسلمانه بۆ خوا پيغەمبەره كەى ﷺ ، هەروه ك دەبيت بلى (أشهد أن لا إله إلا الله ، وأشهد أن محمدا رسول الله ) چونكه ئەمە مەرجى پابەند بوون ئيسلام بوونى هەموو مرۆڤيكه ..؟!

---

[١٤٤] سنن ابو داو برقم (٤٨٤١) فتح الباري كتاب بدء الوحي (١٣/١) و مسند احمد برقم (٨٠١٨)،

(١٤٥) عن عائشة أم المؤمنين (رضي الله عنها) قال : قال رسول الله ﷺ :

((كان دِحيةُ الكلبيُّ تُشبِه لحيتُه وسِنُّه وجهَ جبريلَ عليه السَّلامُ)) [145].

واتە : لە دایکەعائیشەوە (خوا لی رازی بیت ) دەگێرتەوە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (دحیە کەلبی ) هەروەك شێوەی جبریل (علیه السلام ) وایە ، کە لە ریشی و لە تەمەنیدا و لە شێوەی دەم چاوی دا .

تیبینی / کاتیك جبریل وەحی نیگای هینا بۆ پیغەمبەری خوا ﷺ لە سەر شێوەی ئادەمیزاد دا بەزی نەك شێوەی خۆی کە فریشتەی (خوای گەورە ) ، کاتیکیش دابەزی لە سەر شێوەی (دحیە کەلبی ) دابەزی ،شێوەی لە و پیاوە ی دە کرد ، لە رووی ریش و تەمەنیدا لە گەل شێوەی دەم چاوی ..!!

[145] صحيح البخاري ب رقم (٣٦٣٤).

## پیغەمبەری خوا ﷺ لە تەمەنی (٤٠) سالیدا وەحی بۆ هات

✍(١٤٦) عبدالله بن عباس رضي الله عنه قال : قال ﷺ :

((بُعِثَ رَسولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ لأرْبَعِينَ سَنَةً، فَمَكُثَ بمَكَّةَ ثَلاثَ عَشْرَةَ سَنَةً يُوحَى إلَيْهِ، ثُمَّ أُمِرَ بالهِجْرَةِ فَهاجَرَ عَشْرَ سِنِينَ، وماتَ وهو ابنُ ثَلاثٍ وسِتِّينَ)) .[146]

واتە: لە عبدالله کوری عباس رضي الله عنه دە گێرتەوە دەلیت : وەحی و نیگاو پەیمان هاتە خوارە وە بۆ پیغەمبەری خوا لە تەمەنی (٤) سالیدا بوو ، هەروەها لە شاری مككە مایەوە وەحی هاتەوە خوارەوە بۆ ماوەی (١٣) سال ، پاشان فەرمانی کۆچ کردنی پیدار و کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە بۆ ماوەی (١٠) مایەوە وەحی بۆ هات ، هەروەها لە تەمەنی (٦٣) سالیدا کۆچی دوای کرد ﷺ ..!!

[146] صحيح البخاري برقم (٣٩٠٢) و مسلم برقم (٢٣٥١).

## هاتنی وەحی یان نیگا وەك دەنگی شەرخەی میشەنگوین

**(١٤٧) عن عمر بن خطاب ﷺ قال :قال رسول الله ﷺ :**

**(( كانَ إذا أُنْزِلَ عليهِ الوَحيُ سُمِعَ عندَ وجهِهِ كدَوِيِّ النَّحلِ )) .**[147]

**واتە : لە عمری کوری ختاب ﷺ دە گیرتەوە دەلیت : پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : هەر کاتیك وەحی نیگا بە هاتایا گویم لی دە بوو ، لە شیوەی شەرخەی مشینەنگوین یان هەنگ ..!!**

**تیبینی / هەروەك جرس وایە ، چونکە شەرخەی میشەنگین لە شیوەی جەرەسە و لە رزین و گزە گرزە بە شیوەی زاراوەی ئەوم سەردمە پی دەلین : رنین ، یان هزاز ،یان لەرزینی جەرسی مۆبایل تەشبیە نەبیت . ( خوی گەورە زانا ترە ).**

[147] شيخ الالباني في سلسلة الاحاديث ضعيف برقم (٤٣٥٢).

نووسینی :قاسم محسن عولا
٢٠٢٢

نووسینە وە ی فە رموودە کانی ﷺ
بحر الحديث- دە ریای فە رموودە

## فەرمان پی کردنی بە نووسینەوەی وەحی یان پەیامەکەی ﷺ

✍(١٤٨)عن زيد بن ثابت رضي الله عنه قال : قال رسول ﷺ :

((كان رسولُ الله ﷺ إذا نزَلَ عليه الوَحيُ، بعَثَ إلَيَّ، فكَتَبتُه)) .[148]

واتە : لە زیدی کوری ثابت رضي الله عنه دە گێرتەوە دەڵیت : کاتیك وەحی یان نیگاو پەیام بۆ پیغەمبەری خوا ﷺ دە هاتە خوارەوە فەرمانی دە کرد بە هاوەڵانی بینووسنەوە ..!!

تیبینی / هەرکاتیك وەحی دە هاتەوە خوارە وە پیغەمبەری خوا ﷺ بۆ هاوەڵانی شرح دەکرد ئایەتەکانی بۆ دە خویندەوە فیری دە کرد دواتر فەرمانی دەکرد بەنووسینەوەی ئەم ئایەتانە ی قورئانی پیرۆز کە بۆ دەهات لە لایەن جبریل ( عليه السلم ) ..!!

[148] شعيب الأرؤوط في (تخريج سير أعلام النبلاء ) ص ((٤٢٩/٢)).

✍(١٤٩) عن علقمه بن قیس ﵁ قال: قال رسول الله ﷺ :

((إنَّ أولَ ما يُؤتى به الأنبياءُ في المنامِ حتى تهدأَ قلوبُهم ، ثم ينزلُ الوحيُ بعدُ في اليقظةِ)).[149]

واته : لە علقمەی کوری قیس ﵁ دە لیت : پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : لە سەرتادا یەکەم جار کە وەحی یان پەیامی خوا بۆ هەموو پیغەمبەران دیتە خوارەوە ، یەکەم جار لە کاتی نووستن دا واتەبەشیوەی خەو دیت بۆ ئەوەی هیدایەتی دلە کانیان بردیت بۆ ، لە پاشاندا لە شیوەی بە ئاگا بوون وەی دیتە خوارە وە ..؟!

[149] ابن حجر العسقلاني في (فتح الباري لابن حجر ) (١/١٥ ) اسناد حسن .

## خويندنەوەی قورئانی پیرۆز دەبیت بە خەمگینی بیت

(١٥٠) عن بريدة الحصيب الأسلمي رضي الله عنه قال: قال : رسول الله ﷺ :

((اقرؤوا القرآنَ بحُزْنٍ فإنه نَزَل بالحُزْنِ))[١٥٠]

واتە: قورئانی پیرۆز بخوینن بە شیوەیەکی خەمگین ، چونکە لە کاتی دا بەزینی دا لە کاتیکی خەمگین دابەزیوە ..!!

تیبینی / خوینەوەی قورئانی پیرۆز بە خەمگینی ، مەبەست ئەوەیە کاتی قورئان دابەزی لە کاتیکی زۆر ناخۆش خەمگینی دا بوو ، چونکە ئەو کات دوورگەی عەرەبی هەر هەمووی بت پەرست و جاهیل و نەفام بوون ،هەموو دوورگەی عەرەبی دژایەتی قورئانیان دەکرد هەر بۆیە پیغەمبەری خوا ﷺ بۆ قومەکەی زۆر خەمگین بوو لە و کاتەدا ، بەلی هاتنی ئاینی ئیسلام لە سەرەتادا زۆر بە غەریبی دەستی پی کرد ، بی گومان قورئانی پیرۆز بە واتای ئاینی ئیسلام دیت ..!!

[١٥٠] شيخ الألباني في الاحاديث سلسلة ضعيفة برقم (٢٥٢٣).

(١٥١) عن أبي جمرة رضي الله عنه قال: كُنْتُ أُتَرجِمُ بيْنَ يَدَيِ ابْنِ عبَّاسٍ، وبيْنَ النَّاسِ، فأتَتْهُ امْرَأَةٌ، تَسْأَلُهُ عن نَبِيذِ الجَرِّ، فقالَ: إنَّ وفْدَ عبدِ القَيْسِ أتَوْا رَسولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ، فقالَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ: مَنِ الوَفْدُ؟ أوْ مَنِ القَوْمُ؟ قالوا: رَبِيعَةُ، قالَ: مَرْحَبًا بالقَوْمِ، أوْ بالوَفْدِ، غيرَ خَزايا، ولا النَّدامَى، قالَ: فقالوا: يا رَسولَ اللهِ، إنَّا نَأْتِيكَ مِن شُقَّةٍ بَعِيدَةٍ، وإنَّ بيْنَنا وبيْنَكَ هذا الحَيَّ مِن كُفّارِ مُضَرَ، وإنَّا لا نَسْتَطِيعُ أنْ نَأْتِيكَ إلَّا في شَهْرِ الحَرامِ، فَمُرْنا بأَمْرٍ فَصْلٍ نُخْبِرْ به مَن وراءَنا نَدْخُلُ به الجَنَّةَ، قالَ: فأمَرَهُمْ بأَرْبَعٍ، ونَهاهُمْ عن أرْبَعٍ، قالَ: أمَرَهُمْ بالإِيمانِ باللَّهِ وحْدَهُ، وقالَ: هلْ تَدْرُونَ ما الإيمانُ باللَّهِ؟ قالوا: اللَّهُ ورَسولُهُ أعْلَمُ، قالَ: شَهادَةُ أنْ لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ وأنَّ مُحَمَّدًا رَسولُ اللهِ، وإقامُ الصَّلاةِ، وإيتاءُ الزَّكاةِ، وصَوْمُ رَمَضانَ، وأنْ تُؤَدُّوا خُمُسًا مِنَ المَغْنَمِ، ونَهاهُمْ عَنِ الدُّبَّاءِ، والْحَنْتَمِ، والْمُزَفَّتِ. قالَ شُعْبَةُ: ورُبَّما قالَ، النَّقِيرِ، قالَ شُعْبَةُ: ورُبَّما قالَ: المُقَيَّرِ. وقالَ: احْفَظُوهُ، وأَخْبِرُوا به مِن ورائِكُمْ، وزاد ابن معاذ في حديثه عن أبيه قال: المقير. وقال: رسول الله ﷺ للاشج أشج عبد القيس: (إن فيك لخصلتين يحبهما الله: الحلم والأناة)).[١٥١]

[١٥١] صحيح مسلم برقم (١٧) و البخاري برقم (٥٣).

نووسینە وە ی فە رموودە کانی ﷺ
بحر الحديث- دە ریای فە رموودە

نووسینی :قاسم محسن عولا
٢٠٢٢

واته: له ابو جمره ﷺ فه‌رمووی : له خزمه‌ت عبدالله ی کوری عباس دا بووم ﷺ ترجومانیم له نیوان ئه‌و و خه‌لکه‌که دا ده‌کرد ، ئه‌گه‌ر به‌باشی له زاراوه‌ی یه‌کتری تی نه‌گه‌یشتنایه ، من له یه‌کتریم حالی ده‌کردن ،له کاتی قسه و گفتو گوو وه‌لام و پرسیاردا ، له‌سه‌ر دوای عبدالله ی کوری عباس ، خۆی دوومانگ له خزمه‌تی دا مامه‌وه ،ته‌رجومه‌نیم بۆ ده‌کرد ، جاری ئافه‌رتی هاته خزمه‌تی ،له‌باره‌ی خۆشاوی به‌ستووه‌وه پرسیاری لی کرد ، نه‌یی لی کرد له‌وه (به‌ستووه واته : کوو‌په )،

ابو جمر ده‌لیت : منیش عه‌رزیم کرد ،خۆ من کووپه‌له‌یه‌کی سه‌وززم هه‌یه خۆشاوی تیدایه ده‌که‌م و لی ده‌خۆمه‌وه ،فه‌رمووی : شتی وا مه‌که ،چونکه کاتی که نوینه‌ره‌کانی هۆزی عبدالقیس هاتن بۆ خزمه‌ت پیغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رمووی : ئه نوینه‌رانه کین ..؟! یان فه‌رمووی : ئه‌م خزمانه کین ..؟! ووتیان : له هۆزی عبدالقیس که ده‌چیته‌وه سه‌ر هۆزی ره‌بیعه ، پیغه‌مبه‌ریش ﷺ پی فه‌رموون : خزمینه ..!! به‌خیر بین ، ئیوه له ئیسلام بوون دوا نه‌که‌وتوون ،هه‌تا به‌هۆی ئه‌ووه ته‌ریقی شه‌رمه‌زاریتان به‌سه‌ر بی ، وه‌کاریکی واشتان له دژی ئیسلام نه‌کردووه ،که په‌شیمانی له دوا بی ، عه‌رزیان کرد :ئه‌ی پیغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ..!! ئیمه ریگه‌یه‌کی دووری پر زه‌حمه‌ته‌وه هاتووین ، ئه‌ی سه‌ره‌رای ئه‌ویش ئیمه که دیین بۆ خزمه‌تی تۆ ،بۆ شاری مه‌دینه ، به‌سه‌ر ئاوییه‌کانی دیین ،که له کافره‌کانی هۆزی (مضر ) له‌به‌ر ئه‌وه ناتوانن بیین بۆ خزمه‌تت ، مه‌گه‌ر له مانگه حه‌رامه‌کانا ، که هه‌راو شه‌ر شۆرو جه‌نگ تیدا قه ده‌غه کراوه ، که ئه‌م چوار مانگه : نیو چه‌ژنان (ذوالعقدة ) و قوربان و محرم و رجب ،ئاده‌ی بفه‌رموو ،ئامۆژگارییه کی روون و ئاشکرامان پی بفه‌رموو ، که گه‌راینه‌وه بۆ وه‌لاتی خۆمان به خه‌لکه‌که‌ی لای خۆمان رابگه‌یه‌نین و ،هه‌موو پابه‌ندی بین و وکارو ره‌فتاری پی بکه‌ین ،هه‌تا به‌هۆی جی به‌جی کردنی ئه‌وفه‌رمانی تۆوه بچینه به هه‌شت ، فه‌رمووی : له‌باره‌ی ئه‌و ده‌فرانه‌وه که خواردنه‌وه‌یان تی ده کریت پرسیاریان لی کرد ..؟!

**پیغەمبەریش ﷺ فەرمانی پی کردن لە چوارشت و ، وە نهی یانە قەدەغەی کردن لە چوارشت :**

**یەکەم : فەرمانی پی کردین بە باوەر هینان بە خودای تاك و تەنها ، پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئایا دەزانن باوەر هینان بە خودای تاك تەنها چیە و چۆنە ..؟!**

**ووتیان : خوا پیغەمبەرە کەی ﷺ باشتر دەزانن ..!! پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :بریتیە لە شایەتمان لەسەر ئەم شیوەیە ( أشهد أن لا إله إلا الله وحده لاشريك له وأشهد أن محمدا رسول الله . واتە : بەزمان شایەتی دەدەم و بەدل باوەر دەکەم ،کە بی جگە لە الله ی پاك هیچ خوایەکی تر نیە ،خوایەکی تاك و تەنها یە ، بی هاوەلە وهیچ هاوبەشیکی نیە ، بە هەمان شیوە بەدەم بەدل شایەتی دەدەم و باوەرم هەیە کە محمد پیغەمبەری خوایە ﷺ ، دووەم : فەرمانی پی کردین بەکردنی نویژ بەریك و پیکی ، سی یەم : فەرمانی پی کردین بە دانی زەکات .چوارەم : فەرمانی پی کردین بە گرتنی مانگی رەمەزان . وە فەرمانیشی پیان کرد کە لە دەست کەوتەکانی جەنگ پینج یەك بدەن ، وە قەدەغەشی کردین لەم چوارشتە : کە بەکاریان نەهینن بۆ دورس کردنی خۆشاوی سرکەو دۆشاو ،چونکە شتی ناویان زۆر زوو دە ترشیت تیك دەچیت و توند دەبیت و دەبی بە ئارەق مەی وشەراب و بادە ، قەدەغەی کردین لە بەکارهینانی کوولەکەو کوپەلەو بەستووی زەفت دار و کۆتکە دار ، کە بۆ کردنی خۆشاو دۆشاو بەکاریان بهینن . پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەم فەرمایشتانەیش کە لەم ماوەیەدا لە منتان بیستوە ،باش لەبەریان بکەن و رایان بە گەیەنن بەخەلکی وەلاتی خۆشتان . هەروەها لە گیرانەوەی ( عبدالله ی کوری موعاز ) کە لە باوکیەوە ئەمەشی گیراوەتەوە دەلیت: پیغەمبەری خوا ﷺ بەسەرۆکی شاندەکەی ووت : کە ناسراو بوو ،بە ئەشجحی سەرۆکی هۆزەکەی عبدالقيس : دوو رفتاری بەسەندو جوان لە تۆدا هەن ،خوشی دەوین رەزای لەسەریانە ،کە بریتین لە هیمنی و لە سەرخۆیی ..!!**

✍(١٥٢) عن ابى هريره ﷺ قال:

((كانَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ يَوْمًا بارِزًا لِلنَّاسِ، فأتاهُ رَجُلٌ، فقالَ: يا رَسول اللهِ، ما الإيمانُ؟ قالَ: أنْ تُؤْمِنَ باللَّهِ، ومَلائِكَتِهِ، وكِتابِهِ، ولِقائِهِ، ورُسُلِهِ، وتُؤْمِنَ بالبَعْثِ الآخِرِ، قالَ: يا رَسولَ اللهِ، ما الإسْلامُ؟ قالَ: الإسْلامُ أنْ تَعْبُدَ اللَّهَ، ولا تُشْرِكَ به شيئًا، وتُقِيمَ الصَّلاةَ المَكْتُوبَةَ، وتُؤَدِّيَ الزَّكاةَ المَفْرُوضَةَ، وتَصُومَ رَمَضانَ قالَ: يا رَسولَ اللهِ، ما الإحْسانُ؟ قالَ: أنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأنَّكَ تَراهُ، فإنَّكَ إنْ لا تَراهُ فإنَّه يَراكَ، قالَ: يا رَسولَ اللَّهِ، مَتَى السَّاعَةُ؟ قالَ: ما المَسْؤُولُ عَنْها بأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ، ولَكِنْ سَأُحَدِّثُكَ عن أشْراطِها: إذا ولَدَتِ الأمَةُ رَبَّها، فَذاكَ مِن أشْراطِها، وإذا كانَتِ العُراةُ الحُفاةُ رُؤُوسَ النَّاسِ، فَذاكَ مِن أشْراطِها، وإذا تَطاوَلَ رِعاءُ البَهْمِ في البُنْيانِ، فَذاكَ مِن أشْراطِها في خَمْسٍ لا يَعْلَمُهُنَّ إلَّا اللَّهُ، ثُمَّ تَلا صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ: {إنَّ اللهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ ويُنَزِّلُ الغَيْثَ ويَعْلَمُ ما في الأرْحامِ وما تَدْرِي نَفْسٌ ماذا تَكْسِبُ غَدًا وما تَدْرِي نَفْسٌ بأَيِّ أرْضٍ تَمُوتُ إنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ}. قالَ: ثُمَّ أدْبَرَ الرَّجُلُ، فقالَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ: رُدُّوا عَلَيَّ الرَّجُلَ، فأخَذُوا لِيَرُدُّوهُ، فَلَمْ يَرَوْا شيئًا، فقالَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ: هذا جِبْرِيلُ جاءَ لِيُعَلِّمَ النَّاسَ دِينَهُمْ)). [١٥٢]

[١٥٢] صحيح مسلم برقم (١٠) و صحيح البخاري كتاب الايمان برقم (٤٧٧٧) ابن ماجه برقم (٦٤) تاج الاصول بەكوردي ١٨/١.

واتە: لە ابو هريرە ﷺ دەگیرتەوە دەلیت : رۆژی پیغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هات لە شوینیکی بە چاودا لە ناومانا دانیشت ، لە کاتە دا پیاویك هات بۆ خزمەتی ، ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ ئیمان و باوەرم بۆ روون بکەرەوە ، باوەر یان ئیمان چیە ..؟! ئەویش ﷺ فەرمووی: ئەوە تا کە باوەر یان ئیمان بهینی بە خو داو بە فریشتەکانی و ، بە کتابە کەی واتە: قورئانی پیرۆز ، یان نووسراوە کانی ، وە باوەر یان ئیمان بەهینی بە پیغەمبەرەکانی ، وە باوەر یان ئیمان بە هینی بەگەیشتن بە رۆژی دوای یوم القیامەتدا و ، پیاوە کە ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ ئەی ئیسلام چیە ..؟! ئەویش ﷺ فەرمووی: ئیسلام ئەوەیە کە خودا بە پەرستی بەتاك تەنها شریك هاوبەشب بۆ بریار نەدەی ، وە نویژ ئە نجام بدەی بە چاك و ریك پیکی ،زەکاتی مالی خوا بەدەیت ، رۆژووی مانگی رەمەزان بەچاکی بگریت ، وە حەجی مالی خوا بکەیت ..!! پیاوە کە ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ ئەی چاکە چییە ..؟! ئەویش ﷺ فەرمووی : چاکە ئەوەیە کە بە چەشنی وا خودا بەچاکی بپەرستیت کە وەك چاوت لە خودا بی وابی ،خۆ ئەگەر تۆیش ئەو نەبینیت ،بی گومان کە ئەو تۆ لە هەموو حالیکا دەبینی ،کە مادەم وابی شایانی ئەوەیە هەمیشە شەرم و شکۆی لی بکری ..!!

ئینجا ووتی : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ قیامەت کەی بەرپا دەبیت ..؟! یان کەی رۆژی دوای دا دیت ..؟! پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : منیش لە تۆ باشتر نازانم ..!! بەلام وا باسی نیشانەکانی رۆژی دوایت بۆ دەکەم ،ئەوە تە مندال بەچاوی کارەکەر و نۆکە رو خزمەتکار تەماشای دایك باوکی خۆی یان بکەن ، ئەوە یەکیکە لە نیشانەکانی رۆژی دوای وە نزیك بوونەوەی هاتنی قیامەت ، ئا ئەوە تا بەچاوی خۆت بیبینی : رە ش و رووت و پی پەتی و پی خواس و ناکەس پەچە بین بەسەرۆك و کار بەدەستانی سەر خەلکان ،ئەمەش یەکیکە لە نیشانەکانی رۆژی دوای یان نزیك بوونەوەی هاتنی قیامەت ، ئەوەتا بەچاوی خۆ ببینی ، کە شوان و گاوان و ووشترە وان دەشتەکیە کان بین بە خاوەنی مولك وسامان ،خانوو بەرە و کۆشك و تەلاری دروست بکە ، فیزو دەعیە پیوە بکەن ، ئەمەیش یەکیکی ترە لە نیشانەکانی رۆژی دوای یان نزیك بوونەوەی هاتنی قیامەت ، زانینی کاتی هاتنی رۆژی دوای یان قیامەت کەس بە تەواوی نایزانی ،چونکە یەکیکە لە پینج شتە غیبە نهینیانە کە خوا نەبی کەس نایان زانی..!!

**کەبریتیە لەم پێنچ شتە ئەم ئایەتەی فەرمووە : کە ( خوای گەورە ) دەفەرمووی :** ﴿إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ **لقمان ٣٤. واتە : مەبەستی لە م ئایەتە پیرۆزە دا ئەمەیە :زانینی ئەم پێنچ شتە لە علیم و زانیاری غیبیە ،لە جۆرە زانستە نیهێنیە کە هەر خوا خۆی دەزانیت ، قیامەت کەی بەر پادەبیت کەی ئەم رۆژە دیت ..!! هەروەها زانینی باران بارینیش هەر خودا خۆی دەی زانیت کەی باران دە باریت ، هەروەها ئەو کۆرپەلەیەی کە لە ناو سگی دایکی دایە هەر خوای گەورە دەزانیت کە قەدر و ژیان و مردنی رەگەزی ..!! هەروەها کەسیش نازانی لە کوی دەمریت وقەدر ئەجلی و شوینی مردەنەکەی لە کویە ..!!هەروەها کەسیش نازانی سبەینی چی دەکات و چی بەسەر دیت ..!! لەراستیدا خوای گەورە خوا هەر خۆی زاناو دانایە ..!! فەرمووی لە پاشاندا جا کە پیاوە کە رۆیشت لەلای پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەو پیاوە بگیرنەوە بۆ لام ئەوانیش چوون پیاوەکەیان نەبینی ، پیاوە کە غەیب بوو بوو ، جا پیغەمبەری خوا ﷺ ویستی لە کارەکە حالیان بکا، فەرمووی : ئەوپیاوە جبریل بوو ،هاتبوو کە خەلکەکە فیری یاسا سەرەکیە کانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بکا ..!!**

## (١٥٣) عن المسيب بن حزم ﵁ قال:

((لَمَّا حَضَرَتْ أبَا طَالِبٍ الوَفَاةُ، جَاءَهُ رَسولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ فَوَجَدَ عِنْدَهُ أبَا جَهْلٍ، وعَبْدَ اللَّهِ بنَ أبِي أُمَيَّةَ بنِ المُغِيرَةِ، فَقالَ: أيْ عَمِّ قُلْ: لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ كَلِمَةً أُحَاجُّ لكَ بهَا عِنْدَ اللَّهِ فَقالَ أبو جَهْلٍ، وعَبْدُ اللَّهِ بنُ أبِي أُمَيَّةَ: أتَرْغَبُ عن مِلَّةِ عبدِ المُطَّلِبِ؟ فَلَمْ يَزَلْ رَسولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ يَعْرِضُهَا عليه، ويُعِيدَانِهِ بتِلْكَ المَقالَةِ، حتَّى قالَ أبو طَالِبٍ آخِرَ ما كَلَّمَهُمْ: علَى مِلَّةِ عبدِ المُطَّلِبِ، وأَبَى أنْ يَقُولَ: لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ، قالَ: قالَ رَسولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ: واللَّهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لكَ ما لَمْ أُنْهَ عَنْكَ فأنْزَلَ اللَّهُ: {ما كانَ للنبيِّ والذينَ آمَنُوا أنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ} وأَنْزَلَ اللَّهُ في أبِي طَالِبٍ، فَقالَ لِرَسولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ: {إنَّكَ لا تَهْدِي مَن أحْبَبْتَ ولَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ})).[١٥٣]

[١٥٣] صحيح البخاري برقم (٤٧٧٢) و مسلم برقم (٢٤) ، مختصر صحيح مسلم به كوردي به ركي يه كه م ص (١٤-١٥).

واته : له المسيب ی كوری حزم ) له باوكیەوه دە گیریتەوه دەلیت : كاتی نیشانەی مردن یان سەرمەرگی ( ابو طالب )مامی پیغەمبەری خوا ﷺ بووه ، پیغەمبەری خوا ﷺ له لای بوو ، لەو كاتەدا ( ابو جهل ) و ( عبدالله كوری ابو ئومیه ) و ( ولیدی كوری مغیره ) ش له لای بوون ، پیغەمبەری خوا ﷺ به مامی فەرموو : ئەی مامی بەریزم بەلی ( لا إله إلا الله ) خوای گەوره ئەو ووشەیه دەیكاته به بەلگه باوەر و شایەتیت بۆ دەدەم له لای ( خوای گەوره ) لەسەر ئەوه ی كه تۆ ئەم ووشه پیرۆزەت قبول كردووه ..!!بەلام ( ابو جهل ) ( عبدالله ) ( ولید ) له كاتەدا لەوی دا بوون ..!! نزیك بوونەوه چوونه لای ( ابو تالیب ) پیان ووت : دە تەویت له ئاینی عبدالمطلب باب با پیرت خۆت لا بدەیت حاشای لی بكەیت ..؟! ئیتر ئەم سی یانه زۆر قەسەیان له گەل كرد دل یان ساركردوه له ووتنی ( لا إله إلا الله ) بەلام هەموو جاری پیغەمبەری خوا ﷺ دەیدا به گویی مامی دا ئەم ووتەی دووباره دەكردوه كه شایه تمان بەهینی یان باوەر بەهینی به ( لا إله إلا الله ) ررزگاری بیت له ئاگری دۆزەخ ..!! بەلام ئەو سی یانەی تری سەركردەكانی كافرانی قورەیش دووبارەیان دەكردوه دەیان ووت : ئەی ( ابو تالیب ) ئەتەویت له ئاینی باوبا پیرانت حاشا بكەی ،هەتاكو دوا قسەی ئه وه بوو كه ووتی پیان : كه ئەو لەسەر ئاینی عبدالمتلیب ی باوكیەتی ،وه رزانی نەبووه بلی ( لا إله إلا الله ) ..!! ئیتر پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : سویند بەخوا هەر بۆت نزا و پارانەوەت بۆ دەكەم دوای لی خۆش بوونت بۆدەكه لەلای خودای گەوره دا ،بەو مەرجەی كه ( خوای گەوره ) ئەو نزا پارانەوه و لی خۆش بوون بۆ تۆ قەدەغه نەكات ..!! ئینجا ( خوای گەوره ) له بارەیەوه ئەم ئایەت پیرۆزەی نارده خوارەوه كه دەفەرمووی : ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَى مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ﴾ التوبه ١١٣.واته : رەوا نەبووه و نیه ..!! بۆ پیغەمبەر و بۆ ئەوكەسانەی كه باوەریان هیناوه و ئیسلامیان قبول كردووه ، ئەمه بكەن دوای لیخۆش بوون بكەن له ( خوای گەوره ) بۆ كافران و بی باوەران بی ئیمان و هاوبەش پەیدا كاران ، گەر چی ئەو بی باوەرانه خزم و كەس وكاری خۆشیان بیت ،مادەم دەركەوت بۆ یان كەه بی باوەرن ئەو كافرانه شوینیان ناو ئاگری دۆزەخه ..!! هەروەها سەبارەت به ( ابو طالیب ) خوای گەوره ئەم ئایەتەی نارده خوارەوه فەرمووی : ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾ القصص ٥٦.

واته : ئەی پیغەمبەری خوا ﷺ هیدایەت و خستنه سەر یگەی حەق بەدەست تۆ نیه ، بەلكو بەدەست خوایه ..!! لەبەر ئەوه تۆ بەبی خواستی خوا له سەر شتی ناتوانی خۆشەویستانی خۆت بخەیته سەریگەی حەق ..!!

✍( ١٥٤ ) عن ابى هريره ﷺ قال : (( لَمَّا تُوُفِّيَ رَسولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ وكانَ أبو بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عنْه، وكَفَرَ مَن كَفَرَ مِنَ العَرَبِ، فَقالَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عنْه: كيفَ تُقَاتِلُ النَّاسَ؟ وقدْ قالَ رَسولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ: أُمِرْتُ أنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حتَّى يقولوا: لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ، فمَن قالَهَا فقَدْ عَصَمَ مِنِّي مَالَهُ ونَفْسَهُ إلَّا بحَقِّهِ، وحِسَابُهُ علَى اللَّهِ فَقالَ: واللَّهِ لَأُقَاتِلَنَّ مَن فَرَّقَ بيْنَ الصَّلَاةِ والزَّكَاةِ، فإنَّ الزَّكَاةَ حَقُّ المَالِ، واللَّهِ لو مَنَعُونِي عَنَاقًا كَانُوا يُؤَدُّونَهَا إلى رَسولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ لَقَاتَلْتُهُمْ علَى مَنْعِهَا قالَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عنْه: فَوَاللَّهِ ما هو إلَّا أنْ قدْ شَرَحَ اللَّهُ صَدْرَ أبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عنْه، فَعَرَفْتُ أنَّه الحَقُّ )).[154]

---

[154] صحيح البخارى برقم (١٣٩٩) و مسلم (٢٠) و النسائي برقم (٢٤٤٢)و الترمذي برقم (٢٦٠٧) و ابوداود برقم (١٥٥٦-١٥٥٧). و مختصر مسلم به كوردى به ركي يه كه م ص (١٩-٢٠) و التجريد الصريح بوخاري به ركي دووه ص(٩٤).

**واتە: لە ابو هريره ﷺ دە گێرتەوە دەڵیت : کاتی پیغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوای کرد ، وە لە پاش ئەو (ابو بکر ) کرا بە جینیشین یان ئەمیری موسلمانان ،ئەوە ئەو عەرەبانە لە پاش کۆچی دوای پیەمبەری خوا ﷺ پاگەز بوونەوە هەڵگەرانەوە پەیدا بوو ، وە (ابو بکر ) ویستی بچیت بە گژیاندا ، لەم بارەیەوە (عمری کوری خەتاب ) پی فەرموو: تۆ جۆن جەنگ و کوشتار دەکەی لەگەل ئەم خەلکەدا و ، بەلگەت چییە لەم بارەیەوە ..؟! وە (عمری کوری خەتاب ) فەرمووی : ئەی چی دەکەیت ..؟! لەوە کە پیغەمبەری خوا ﷺ دە فەرمووی : (( فەرمانم پیکراوە لە لایەن (خوای گەورە ) کە شەر و کوشتار لە گەل ئەو خەلکەدا بکەم ، کە هاوەل بۆ خودا پەیدا دەکەن ، تا شایە تمان دەهینن بە زمان دەلین : (لاإله إلا الله )ئیتر ئەو کەسەی کە ئەمە بلی : ئەو سەرو مالی خۆی لەمن قەدەغە دەکاو ، خوین و نامووس و سەرو سامانی لەمن حەرام دەبی مەگەر لەسەر مافیکی رەوا ، کە لەسەری بی بە پی یاسا نامەی خودا ، وەك کەسیکی بە نارەوا کوشتبی ، ئەوە دە کوژریتەوە لە جیاتی ئەوە ، وەئیتر حیساب و لیپرسینەوەی لە سەر نیازی دلی ، لە و دنیا لەسەر خودا خۆیەتی ؟ جا بووم روون بکەرەوە ئایا ئەم بریارو هەلویستەی تۆ چۆن لەگەل بریاری ئەم فەرموودەیە ی پیغەمبەر ﷺ دا یەك دە گرنەوە ..؟!؟ ◻**

**(ابو بکر )یش وەلامی دایەوە فەرمووی : ئەی (عمری کوری خەتاب ) ئەوەی تۆ دەلی هەر هەمووی راستە بەلام بە سەلەکە گەلیك لەم بارەیە گەورە ترە یان قولترە ،سویند بەخودا زۆر باش دەچم بەگژ ئەوانەدا کە فەرقی نویژو زەکات دەکەن و دەلین : نویژ فەرزە بەلام زەکات فەرز نیە نایدەین ..!! چونکە ئەوە رفتارە یان برو بیانوو گرتنە ، هەر وەك نویژ فەرزە ئاواش زەکات فەرزە ، ئەو مافیە کە خوای گەورە دایناوە پیویستی کردووە لە سامانەکانیا ، وەئەوەی حاشا لی بکات و ئەنکاری بکات ئەوا حاشای و ئەنکار لە ئەصولی ئاین دەکات ، جا لەبەر ئەوە دەچم بەکژیاندا ،هەروەها (ابو بکر ) ووتی : سویند بەخوا ئەگەر لە و بارەیەوە جیاوازی لە نیوانی من پیغەمبەردا ﷺ بکەن ، لییان قبول ناکەم ، کەواتە ئەگەر لەمەوبەر پەتە زەکاتی یا گیسکە زەکاتیکیان دابی بە پیغەمبەریو ئیستا بە برو بیانوی بی بنەما نەیدەن بە من ، کە خەلیفەی پیغەمبەری خوام ﷺ و فەرمانرەوای گشتی موسلمانانم ، لەسەر نەدانی ئەو پەتە یا ئەو گیسکە دەچم بەگژیاندا جەنگ و کوشتاریان لە گەل دا دەکەم هە تاکو زەکات دەدەن کە صەرفی بکەن بۆ پەرژەوەندی ئاین و دەولەتی ئیسلام هەروەها (عمری کوری خەتاب ) دەی فەرموو : سویند بەخودا دیار بوو کە کردنی ئەو جەنگە وکوشتارەی هەلگەراوەکان یان مرتەدەکان ،شتی بوو لە خوداوە و خودا خۆی خست بوویە دلی (ابو بکر )وە بەرە بەرە منیش بۆم دەرکەوت کە بەلگەو فەرمایشتەکەی (ابو بکر ) راست و حەق بوو )).◻**

(١٥٥) عبد الله بن عمر رضي الله عنهما قال : قال رسول الله ﷺ :

(( أُمِرْتُ أنْ أُقاتِلَ النَّاسَ حتَّى يَشْهَدُوا أنْ لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ وأنَّ مُحَمَّدًا رَسولُ اللهِ، ويُقِيمُوا الصَّلاةَ، ويُؤْتُوا الزَّكاةَ، فإذا فَعَلُوا، عَصَمُوا مِنِّي دِماءَهُمْ، وأَمْوالَهُمْ إلَّا بحَقِّها، وحِسابُهُمْ علَى اللَّهِ )).[155]

واته : لە عبدالله كورى عمر رضي الله عنهما دە گيرتەوە لە پيغەمبەرى خوا ﷺ فەرمووى :

فەرمانم پى كراوە لە لايەن ( خواى گەورە ) وە كە شر بەكەم يان كوشتار بكەم لە گەل ئەم خەلكەدا ، هەتا كو شەيتمان دەهينن هەتا كو دەلين:( يشهدوا أن لا إله إلا الله ، وأن محمدا رسول الله ) وە تا پيچ فەرزەى نويژ رۆژانەبەجوانى ريك پى كى دەكەن ، زەكاتى فەرزى خواى گەورە دەدەن ، كاتى ئەوە يان كرد ،ئيتر سەرو مال و خوين و نامووسيان لەمن قەدەغە دەبى ،مەگەر لەسەر حەقى شەرعى ،چا لەدواى ئەوە ليپرسينەوەيان لەبارەى نيازى دليانەوە لەو جيهانا لەسەر خوايە ..!!

[155] صحيح مسلم برقم (٢٢) و البخاري برقم (٢٥) التجريد الصريح البخاري به كوردي به ركي يه كه م ص(٤٤) .

✍( ١٥٦ )أنس بن مالك قال: أن رسول الله ﷺ قال : (( أُمِرتُ أن أقاتلَ المشرِكينَ حتَّى يشهَدوا أن لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ وأنَّ محمَّدًا عبدُهُ ورسولُهُ، فإذا شهِدوا أن لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ وأنَّ محمَّدًا عبدُهُ ورسولُهُ، وصلَّوا صلاتَنا، واستقبلوا قبلتَنا، وأكَلوا ذبائحَنا، فقد حرُمَتْ علينا دماؤُهُم وأموالُهُم إلَّا بحقِّها ، لهم ما للمسلمين وعليهم ما عليهم )).[156]

واتە: لە انسی كوری مالك ؓ دە گیرتەوە دەلیت : پیغەری خوا ﷺ فەرمووی : فەرمانم پیكراوە لە گەل خەلكیدا بجەنگم هەتا شایە تمان دە هینن بەوەی دە لین : ( شهدوا أن لا إله إلا الله ، وأن محمدا رسول الله ) واتە : هیچ پەرستراویك بەحەق نیە جگە لە ( الله ) ،وە محمدیش پیغەمبەری خوایە ، جا ئەگەر شایە تیاندا بەوەی هیچ پەرستراویك نیە بەحەق نیە جگە لە ( الله ) محمدیش پیغەمبەری خوایە ،وە روویان كردە قیبلە كەمان ، ئەوا سەربراوەكانیمان خوارد و هەر وەكو ئیمەش نویژیان كرد ،ئەوە خوین مالیان لەسەر ئیمە قەدەغە بووە ، مەگەر بە حەقی ئیسلام ،ئەوەی بۆ موسلمانان بیت بۆ ئەوانیشە ، ئەوەشی لەسەر موسلمانان بیت لەسەر ئەوانیشە ..!!

[156] صحيح البخاري برقم (٣٩٩٩) ومسلم برقم (١٧٠٩) و سنن النسائي به كوردى به ركي جواره م. ص (٢٩٦)

✍( ١٥٧ ) – عن عبدالله بن عمر رضي الله عنهما قال : قال رسول الله ﷺ :(( بُنِيَ الإسْلامُ علَى خَمْسٍ، شَهادَةِ أنْ لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ، وأنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ ورَسولُهُ، وإقامِ الصَّلاةِ، وإيتاءِ الزَّكاةِ، وحَجِّ البَيْتِ، وصَوْمِ رَمَضانَ )) .[١٥٧]

واته: له عبدالله کوری عمره رضي الله عنهما دهگێرتهوه دهڵیت : پیغهمبهری خوا ﷺ فهرمووی : بنهماکانی ئیسلام له سهر پینج پاییه ، یهکه: شایه تمان ( شَهادَةِ أنْ لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ، وأنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ ورَسولُهُ،دووهم : فهرزی کردنی نویژ ،سی یهم : دانی زهکات ،چوارهم حهجی مالی خوا ، پیینچهم : رۆژووی مانگی رهمهزان .

[١٥٧] صحيح مسلم برقم (١٦) .




## بەیعەت دان بە پێغەمبەری خوا ﷺ

✍(١٥٨)عن جرير بن عبدالله رضي الله عنه قال :((بَايَعْتُ رَسولَ ﷺعلَى شَهَادَةِ أنْ لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ، وأنَّ مُحَمَّدًا رَسولُ اللَّه، وإقَامِ الصَّلَاةِ، وإيتَاءِ الزَّكَاةِ، والسَّمْعِ والطَّاعَةِ، والنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ )).[١٥٨]

واتە: لە جریری کوری عبدالله دە گێرتەوە دەلیت : کاتی بیعەتیان لە پیغەمبەری خوا ﷺ وەردەگرت دەیفەرموو: شایە تمان بهینن بەلین :أَشْهَدَوأنْ لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ، وأنَّ مُحَمَّدًا رَسولُ اللَّهِ، وە نویژە کانتان بەچاکی وریکوپییکی ئە نجام بدە ، وەزەکاتی مالی خوا بدەن ،وە گورایەل و شوینکەوتەی من بن لە ووتەو کردەوکانی رۆژانە ،وە ببنە کەسانی ئامۆژکاری کار بۆ هەموو موسلمانیك ..!!

---

[١٥٨] صحيح البخاري برقم (٢١٥٧).

✍📖نووسینه وە ی فه رموودە کانی ﷺ
بحر الحديث- دە ریای فه رموودە

نووسینی :قاسم محسن عولا
٢٠٢٢

✍(١٥٩) عن البراء بن عازب رضي الله عنهما قال :قال رسول الله ﷺ :

(( لا يُحِبُّ الأنصارَ إلا مؤمنٌ ، ولا يُبْغِضُهم إلا منافقٌ ، ومَن أَحَبَّهم أَحَبَّهُ اللهُ ، ومَن أَبْغَضَهم أَبْغَضَه اللهُ )).[١٥٩]

واتە: لە برائی کوری عازبە وە دەگێرتەوە دەلیت : پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : سەبارەت بە ئەنصارەکان هیچ کەسیك خۆشیانی ناویت مەگەر ئیماندار نەبیت ، وە هیچ کەسیك رقی لیان نیە مەگەر مونافق و دوورووبیت ، ئەوە کەسەی ئەوانی وخوش بویت واتە :ئەنصارەکان ، ئەوا خوای گەورە خۆشیانی دەویت ، ئەوەی رقی لە ئەوان بیتەوە ئەوا خوای گەورە رقی لیدەبیتەوە ..!!

تیبینی /مەبەست لەم فەرموودەیە ،ئەوەیە ئەو کە سەی کە وەك ئەنصارە کان پالپشتی پیغەمبەر ﷺ دەکات بانگەوازی ئاینەکەی دەکات ئەوا خوای گەورە خۆشی ئەوەیت ،ئەو کەسەش رقی لە پیغەمبەری خوا ﷺ وە رقی لە هاوەلەکانی پیغەمبەری خوا ﷺ وئەنصارو کۆچکەران نە ئەوانەی هاوشیوەی ئەوان کاری چاکە دەکەن لە بانگەوازی ئیسلام ،ئەوا خوای گەورە خۆشیانی ئەویت ..!!

[١٥٩] شيخ الالباني صحيح الجامع برقم (٧٦٢٩) و صحيح البخاري برقم (٣٧٣٨).

✍(١٦٠) عن ابوسعيد الخدري رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال :

(( لا تُصاحِبْ إِلَّا مُؤْمِنًا ، ولا يَأْكُلْ طَعَامَكَ إِلَّا تَقِيٌّ )).[١٦٠]

واتە : لە ابی سعید خدری رضي الله عنه دەگیرتەوە لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :هاوریەتی هیچ كەسیك مەكە ئەگەر باوەردار نەبیت یان ئیماندار نەبیت ،وە با هیچ كەسیك لە خواردنەكەت نەخوا ئەگەر لە خوا ترس نەبیت یان تەقوا دار نەبیت ..!!

تیبینی / بەمەست لەم فەرموودەیەدا ، ئەوەیە هاوریەتی كەسانی بروادارو ئیماندار بكەن چونكە هیچ كات ئەوی باوەری بە خوا پیغەمبەرەكەی وە بە كتابەكەی یان بە رۆژی دوای هەبیت ،نەتاوان نەخراپە ئە نجام دەدات ،خۆی دوور دەكاتەوە لە كاری خراپەكاری شیتی پرو پووچ تاوان كوناه ، بەلام ئەوەی براوی بە خوا و پیغەمبەرەكەی نەبیت یان بە حیساب و رۆژی دوای نەبیت ئەو هەموو خراپە كاریەكی لی دەوەشیتەوە ، خیانەت و دزی كردن زیناو شراب خواردن و پیاو كوشتن و جاسوسی كردن و درۆكردن و هەموو تاوانەگەورە كان ئە نجام دەدات ، هەر بۆیە قەدەغەی كردووە لەسەر سەفرش دا نانی لە گەل دا بخۆی چونكە پیاویكی پیش نجس دلیكی رەشی پیوەی ختم نا پاكی لیدراوە ..!

[١٦٠] سنن ابي داود برقم (٤٨٣٢ ) وشيخة الالباني صحيح الموارد برقم او الصفحة (١٧٢١).

(١٦١) عن سهل بن سعد الساعدي رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ:

((لو كانت الدُّنيا تعدِلُ عند اللّٰهِ جناحَ بعوضةٍ ما سقَى كافرًا منها شرْبةَ ماءٍ)).[161]

واتە: لە سە هلی کوری سعیدی ئەلساعدی وە رضي الله عنه دەگێرتەوە لە پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر دونیا لای خوای گەورە بە قەد باڵە میشوولەیەك نرخی هەبوایە، ئەوا نەی دەهیشت هیچ کافریك تیدا تەنانەت یەك قومیك ئاویش بخوات..!!

روونکردنەوە/ روون کردنەوەی ئەم فەرموودەیە ئەوەی کە ژیانی دونیا هیچ بە هایەکی نیە بۆ باوەر دری راستەقینە بە ئەخلاص و نیەتی پاکی خۆی، بەلکو بۆ باوەردار تەنا ئیمتحان تاقی کردنەوەی (خوای گەورە) چونکە ئەو بەهەشتی بۆ ئامادەکراوە نرخەکەی زۆر لە دونیا بە بەهاتر گەورە ترو زۆر ترە کە بە عەقلی هیچ کەسیك نایەت پاداشتەکەی بە هەشت چەند بەرانبەری سەرتاپەی هەموودنیا یە، بەلام کافری چاو چنۆك بی باوەر مونافیق فاسق نرخ بۆ ژیانی دونیا دادەنێن بیر لە حیساب وکتابی (خوای گەورە) ناکەنەوە هەر خەریکی دونیا پەرستی و سگ و وورگ پرکردنی خۆیانن بە رەفایی دەژین بیر لەمردن ناکەنەوە، تەنیا مەبەستیان بەتالان بردنی مالی خەلکە، هەر بۆیە ئیماندارێ راستە قینەهیچ بە هایەك بۆ ژیانی دونیا دانانی بیرشی لیناکاتەو چونکە دەزانیسەر ئە نجامی مردنە لیپرسینەوەیە لەو مال و سامانە خۆشی تەمنی دونیا پی وایە ئەوە ئەمانەت نەك پاداشت بەلکو پاداشتی راستەقینە بەهەشتە نەك خۆشی دونیا رابواردنی لەسەر خەلکی فەقیرو هەژار دا، هەر بۆ یە ژانی دونیا نرخی باڵە میشوولە کی نیە..!!

---

[161] سنن الترمذي برقم (٢٣٢٠) و المنذري في (الترغيب والترهيب) ص (٤/١٥٨).

✍(١٦٢) عن ابي هريرة ﷺقال : قال رسول الله ﷺ :

((والذي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بيَدِه، لا يَسْمَعُ بي أحَدٌ مِن هذه الأُمَّةِ يَهُودِيٌّ، ولا نَصْرانِيٌّ، ثُمَّ يَمُوتُ ولَمْ يُؤْمِنْ بالَّذِي أُرْسِلْتُ به، إلَّا كانَ مِن أصْحابِ النَّارِ)).[١٦٢]

واتە : لە ابی هریرە ﷺ دەگێرتەوە دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :

سوێند بەو زاتەی کە نەفسی منی بەدەستە ، هیچ کەسێك نییە لەم ئومەتە لە جوولە کەو نصرانیەك سەبارەت بە من ببیستێت و پاشان بمرێت لەسەر باوەر نەهێنان بە پەیامەی کە من پێی رەوانە کرام ..!! ئەوا لە ئەهلی دۆزەخدایە ..!!

تێبینی / روونکردنەوەیە بۆ ئەو کەسانەی دەلێن جوولەکەو نصرانی برای ئیمەن یان ئەوانیش خاوەنی کتاب پێغەمبەرایان بۆ هاتووە ..!! یان ئەوان بە کافرو موشریك دانانین ئەلێن ئەوانیش ئیماندارن یان ، بەلی ئەم فەرموودەیەئاگاداریە بۆ ئەو کەسانە کە هاوکارو یارمەتی دەری ئەم دووئاینەدەکەن ، کە دەلێن ئەوانی ئاینی ئاسمانین یان لە گەل ئاینی ئیسلامدا دەی چووینن ، نەخێر ، هیچ وانیە ، چونکە ئەم دووئاینە لەدوای هاتنی ئیسلام نسخ کران پەیرەوانی ئەم دووئاینە دەبێت باوەر بە پێغەمبەر پەیامەکەی بکەن ،چونکە جگە لە ئاینی ئیسلام هیچ ئائیکی تر قبول کراو نیە ، هەر بۆیە ئەم دوو ئاینە موشرك بی باوەران بە ئاینی ئیسلام ،ئاینی ئیسلام ئانی هەمووپێغەمبەرانە، وە ئاینی پەروەردگارە ئەوکەسەی پەیرەوی نەکان ئەو بۆ ئاگری دۆزەخە ..!!

[١٦٢] صحيح مسلم برقم (١٥٣).

# سزای شريك و هاوبەش بڕیاردان بۆ خوای گەورە

(١٦٣) عن أنس بن مالك رضي الله عنه قال : رسول الله صلى الله عليه وسلم :

((إنَّ اللَّهَ يقولُ لأهْوَنِ أهْلِ النَّارِ عَذابًا: لو أنَّ لكَ ما في الأرْضِ مِن شيءٍ كُنْتَ تَفْتَدِي به؟ قالَ: نَعَمْ، قالَ: فَقَدْ سَأَلْتُكَ ما هو أهْوَنُ مِن هذا وأَنْتَ في صُلْبِ آدَمَ، أنْ لا تُشْرِكَ بي، فأبَيْتَ إلَّا الشِّرْكَ)).[١٦٣]

لە ئەنەسی كوری مالیكەوە رضي الله عنه دە لیت : كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت : خوای گەورە بە ئەو كەسە دەفەرموێت كە سووكترین سزای هەیە لە دۆزەخدا: «ئەگەر هەموو شتێكی سەر زەوی موڵكی تۆ بوایە، ئایا دەتبەخشی تەنها بۆ ئەوەی خۆت ڕزگار بكەیت؟ «دەڵێت: بەڵێ .پەروەردگار دەفەرموێت» :داوای شتێكم لێكردیت لەمە كەمتر كاتێك لە بڕبڕەی پشتی ئادەم بوویت) :هاوبەش وشەریک بۆ من بڕیار نەدەیت، بەڵام تۆ پێداگیر بوویت لەسەر شیرک وهاوبەش بڕیاردان..!!

**تیبینی** / خوای گەورە دەفەرمویت بەو کەسەی کە سوکترین وکەمترین سزا دەدرێت لە ڕۆژی قیامەتدا: ئەگەر هەموو زەوی موڵکی تۆ بوایە، ئایا دەتبەخشی بۆ ئەوەی خۆت ڕزگار بکەیت لەم سزایە؟ دەڵێت :بەڵێ .پەروەردگار دەفەرموێت :داوای شتێکم لێکردیت لەمە کەمتر کاتێک لە بڕبڕەی پشتی باوکت بوویت، پەیمانم لێت وەرگرت کە شیرک وهاوبەشم بۆ بڕیار نەدەیت، بەڵام تۆ پەیمانەکەت بەسەر نەبرد وشیرک وهاوبەشت بۆ من بڕیار دا، خوای گەورە دەفەرموێت} :وَإِذۡ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَأَشۡهَدَهُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَلَسۡتُ بِرَبِّكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدۡنَآۚ أَن تَقُولُواْ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنۡ هَٰذَا غَٰفِلِينَ]الأعراف: ١٧٢[{، واتە} :وکاتێک کە پەروەردگارت وەریگرت) دەری هێنا (لە پشتی ئادەمیەکان وەچە ونەوەکانیان، وکردنی بە شاهێد بەسەر خۆیانەوە، پێی ووتن :ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟) لە وەڵامدا (ووتیان: بەڵێ شاهێدیماندا، هەتا نەڵێن لە ڕۆژی دواییدا بە ڕاستی ئێمە بێئاگا بووین لەمە) کە خودا پەروەردگارمانە..!!

---

[١٦٣] صحيح البخاري برقم (٣٣٣٤) و مسلم برقم (٢٨٠٥) متف عليه .

نووسینە وە ی فە رموودە كانی ﷺ

بحر الحديث- دە ریای فە رموودە

نووسینی :قاسم محسن عولا
٢٠٢٢

## حوكمی بە كافر یان فاسق دانانی كەسیك ئەگەر وانەبی

✍(١٦٤)عن ابوذر الغفاري ﵁ قال : قال رسول الله ﷺ :

((لا يَرْمِي رَجُلٌ رَجُلًا بالفُسُوقِ، ولا يَرْمِيهِ بالكُفْرِ" إلَّا ارْتَدَّتْ عليه إنْ لَمْ يَكُنْ صاحِبُهُ كَذلكَ )) .[164]

**واتە : لە ابو زر غفاری ﵁ دەلیت : گویم لە پیغەمبەری خوا ﷺ بوو دەی فەرموو :**

ئەگەر هەرکەسێک تۆمەتی تاوان) فاسقێتی (یان کوفر بۆ هەرکەسێکی تر هەڵبواسێت، ئەگەر هاوەڵەکەی بەو شێوەیە نەبێت؛ ئەوا تۆمەتەکە بۆ دژی خۆی دەگەڕێتەوە..!!

**تێبینی /پیغەمبەری خوا ﷺ** ، حەرامی کردووە کە مسوڵمانێک بە برای مسوڵمانی بڵێت :ئەی فاسق یان ئەی کافر، چونکە ئەگەر هاوەڵەکەی بەو شێوەیە نەبێت، ئەوا ئەم وشە وتۆمەتە بۆ ئەو کەسە دەگەڕێتەوە کە وتوویەتی. **بی گومان حەرامە بۆ هەر كەسیك بی بەلگەی شەرعی بە كەسیك بلیت : كافرە یان فاسقە ، ئەمە تاوانیكی یەكجار گەورە یە ، بەبی بەلگەی شەرعی حوكم بدات لە سەر كافر بوون یان فاسق بوونی هەر كەسیك ، دەبیت بە بەلگە بەسەلمینی كەوا كافر بووە یان فسقی تیدا بەدی دەكریت ، هینانی بەلگە دەبیت قورئان فەرموودەبیت ..!!**

---

[164] صحيح البخاري برقم (٦٠٤٥) ومسلم برقم (٦٠).

✍📖نووسینه وه ی فه رمووده كانی ﷺ
بحر الحديث- ده ریای فه رمووده

نووسینی :قاسم محسن عولا
٢٠٢٢

✍(١٦٥) عن ابي ذر الغفاري ﵁ عن النبي ﷺ فيما يرويه عن ربه تعالى :

((عَنِ النَّبيِّ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ فِيما رَوَى عَنِ اللهِ تَبارَكَ وتَعالَى، أنَّهُ قالَ: يا عِبَادِي، إنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ علَى نَفْسِي، وَجَعَلْتُهُ بيْنَكُمْ مُحَرَّمًا، فلا تَظَالَمُوا، يا عِبَادِي، كُلُّكُمْ ضَالٌّ إلَّا مَن هَدَيْتُهُ، فَاسْتَهْدُونِي أَهْدِكُمْ، يا عِبَادِي، كُلُّكُمْ جَائِعٌ إلَّا مَن أَطْعَمْتُهُ، فَاسْتَطْعِمُونِي أُطْعِمْكُمْ، يا عِبَادِي، كُلُّكُمْ عَارٍ إلَّا مَن كَسَوْتُهُ، فَاسْتَكْسُونِي أَكْسُكُمْ، يا عِبَادِي، إنَّكُمْ تُخْطِئُونَ بالليْلِ وَالنَّهَارِ، وَأَنَا أَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا، فَاسْتَغْفِرُونِي أَغْفِرْ لَكُمْ، يا عِبَادِي، إنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغُوا ضَرِّي فَتَضُرُّونِي، وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفْعِي فَتَنْفَعُونِي، يا عِبَادِي، لو أنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وإنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، كَانُوا علَى أَتْقَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنكُمْ" ما زَادَ ذلكَ في مُلْكِي شيئًا، يا عِبَادِي، لو أنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وإنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، كَانُوا علَى أَفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ" ما نَقَصَ ذلكَ مِن مُلْكِي شيئًا، يا عِبَادِي، لو أنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وإنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، قَامُوا في صَعِيدٍ وَاحِدٍ فَسَأَلُونِي، فأعْطَيْتُ كُلَّ إنْسَانٍ مَسْأَلَتَهُ" ما نَقَصَ ذلكَ ممَّا عِندِي إلَّا كما يَنْقُصُ المِخْيَطُ إذَا أُدْخِلَ البَحْرَ، يا عِبَادِي، إنَّما هي أَعْمَالُكُمْ أُحْصِيهَا لَكُمْ، ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إيَّاهَا، فمَن وَجَدَ خَيْرًا فَلْيَحْمَدِ اللَّهَ، وَمَن وَجَدَ غيرَ ذلكَ فلا يَلُومَنَّ إلَّا نَفْسَهُ ))[١٦٥]

[١٦٥] صحيح مسلم برقم (٢٥٧٧)

له ئەبو زەری غەفارییەوە -ڕەزای خوای لێبێت- کە پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- لە پەروەردگارییەوە دەیگێڕێتەوە کە پەروەردگار -سبحانه وتعالى -دەفەرموێت» : ئەی بەندەکانم، من ستەمم لە سەر نەفسی خۆم حەرامکردووە بۆیە ستەم لە یەکتری مەکەن، ئەی بەندەکانم، هەمووتان گومڕان جگە لە ئەوانە نەبێت کە من هیدایەتم داون بۆیە داوای هیدایەت لە من بکەن؛ هیدایەتتان دەدەم. ئەی بەندەکانم، هەمووتان برسین جگە لە ئەوانەی کە من تێرم کردوون، بۆیە داوای ڕزق لە من بکەن؛ ڕزقتان دەدەم، ئەی بەندەکانم، هەمووتان ڕووتن وعەیبە وکەموکورتیتان دیارە جگە لە ئەوانە نەبێت کە من پۆشیومن، بۆیە داوای پۆشین لە من بکەن؛ دەتان پۆشم. ئەی بەندەکانم، ئێوە بە شەو وڕۆژ گوناھ وتاوان دەکەن، ومن لە هەموو تاوانەکان خۆش دەبم، بۆیە داوای لێخۆشبوون لە من بکەن؛ لێتان خۆش دەبم. ئەی بەندەکانم، ئەگەر لە یەکەم کەسەوە بۆ دواین کەس لە ئێوە بە مرۆڤ وجنۆکەوە لە سەر دڵی تەقوادارترین) لە خوا ترس ترین (کەسی ئێوە بن، ئەوا ئەمە هیچ لە موڵکی من زیاد ناکات. ئەی بەندەکانم، ئەگەر لە یەکەم کەسەوە بۆ دواین کەس لە ئێوە بە مرۆڤ وجنۆکەوە لە سەر دڵی خراپەکارترین) گوناهبارترین (کەسی ئێوە بن، ئەوا ئەمە هیچ لە موڵکی من کەم ناکات، ئەی بەندەکانم، ئەگەر لە یەکەم کەسەوە بۆ دواین کەس لە ئێوە بە مرۆڤ وجنۆکەوە بە هەمووتانەوە لە یەك شوێن بووەستن و داوا لە من بکەن، ئەوا من داواکاری هەمووی جێبەجێ دەکەم ئەوەندە لە موڵکی من کەم دەکات هەروەکو چۆن دەزوویەك لە ئاوی دەریا کەم دەکاتەوە کاتێك دەخرێتە ناو دەریاکە ودەهێندرێتە دەرەوە، ئەی بەندەکانم، ئەوە تەنها کردەوەکانتانە من بۆتان دەبژێرم، وپاشان پاداشتتان دەدەمەوە) بە چاکە وخراپە(، جا بۆیە ئەوەی خێر وخۆشی بینی؛ ئەوا با سوپاس وحەمدی خودا بکات، وئەوەش جگە لە ئەوەی بینی؛ ئەوا با تەنها لۆمەی نەفسی خۆی بکات..!!

**تیبینی** /ئەم فەرمووده قودسیه سوودی زۆری تێدایه سەبارەت به بنچینەکانی ئاین، ولقەکانی وئادابەکانی، که باسی ئەوه دەکات خوای گەوره ستەم وزوڵمی له سەر خۆی حەرامکردووه وەکو فەزڵێک له لایەن ئەوەوه وچاکەیەک بەرامبەر به بەندەکانی، وله نێوان دروستکراوەکانیش زوڵمی حەرامکردووه بۆ ئەوەی کەس زوڵم له کەسی تر نەکات، وبوونەوەرەکان هەموویان گومڕان له ڕێگای هەق جگه لەوانه نەبێت که خوای گەوره هیدایەتی داون به هیدایەتی خۆی، وئەوەی داوا له خودا بکات ئەوا خوای گەوره هیدایەتی دەدات وسەرکەوتووی دەکات، ودروستکراوەکان هەژارن وپێویستیان به خوای گەورەیه، وئەوەی داوای له خودا بکات ئەوا خوای گەوره پێداویستییەکانی بۆ جێبەجێ دەکات، بەندەکان شەو وڕۆژ تاوان دەکەن وخوای گەوره دایان دەپۆشێت ولێیان خۆش دەبێت ئەگەر بەندەکان داوای لێخۆشبوون بکەن له خوای گەوره، ئەوان هەرگیز ناتوانن سوود وزیان بگەیەنن به خوای گەوره هەرچەندێکیش هەوڵ بدەن به قسه وکردایان، وئەگەر هەموو بەندەکان له سەر دڵی یەک کەسی تەقوادار بن یان له سەر دڵی یەک کەسی تاوانکەر بن ئەوا تەقواکەیان هیچ شتێک له موڵکی خوای گەوره زیاد ناکات وتاوانکردنیان هیچ شتێک له موڵکی خوای گەوره کەم ناکاتەوه، چونکه ئەوان بەندەن وهەژارن وپێویستیان به خوای گەوره له هەموو حاڵ وکات وشوێنێکدا، وئەگەر هەموو بەندەکان له یەک شوێن بن داوا له خوای گەوره بکەن ئەوا خودا هەر یەکێکیان چی بوێت پێی دەبەخشێت وئەمیش هیچ شتێک له موڵکی خوای گەوره کەم ناکات، چونکه خەزێنەکانی خودا بەردەوام پڕن وئەگەر بەردەوام ببەخشێت به شەو وڕۆژ تەنانەت شتێکی بچووکیشیان لێ کەم نابێتەوه، خوای گەوره هەموو کردەوەکانی بەندەکانی تۆمار دەکات ئەوەی بۆ ئەوانه وئەوەیشی لەسەریانه، پاشان پاداشتیان دەداتەوه له ڕۆژی قیامەت بۆیه ئەوەی پاداشتی کردەوه چاکەکانی بینی ئەوا با سوپاسی خوای گەوره بکات چونکه سەرکەوتووی کرد بۆ ئەنجامدانی پەرستنەکان، وئەوەیشی جگه له ئەوەی بینی (سزای بینی) ئەوا با تەنها لۆمەی نەفسی خراپەکاری خۆی بکات که بەرەو تاوان بردی..!!

(١٦٦) عن ابي هرير ﷺ قال : قال رسول الله ﷺ :

(( إِنَّ اللّهَ تعالى لَا ينظرُ إلى صُوَرِكُمْ وَأَمْوالِكُمْ ، ولكنْ إِنَّما ينظرُ إلى قلوبِكم وأعمالِكم )).[١٦٦]

**واتە لە ابو هريرە ( خوا لی رازی بیت ) دە لیت : پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :**

خوای گەورە سەیری لاشەتان و وێنەتان ناکات بەڵکو سەیری دڵتان وکردەوەتان دەکات..!!

**تیبینی /خوای گەورە پاداشتتان ناداتەوە بە هۆی شێوەی لاشە وڕووخسارتان وئەمانە بە هیچ شێوەیەک لە خودا نزیکتان ناکەنەوە، بەڵکو پاداشت بە گوێرەی ئەوەی لە ناو دڵتاندایە لە دڵسۆزی وئیخلاص وڕاستگۆیی وکردەوەی چاک بۆ خوای گەورە..!!**

١٦٦ شيخ الالباني في صحيح الجامع برقم (١٨٦٢) .

✍(١٦٧) عن عبادة بن الصامت رضي الله عنه قال : قال رسول الله ﷺ :

((مَن شَهِدَ أنْ لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ له، وأنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ ورَسولُهُ، وأنَّ عِيسَى عبدُ اللَّهِ ورَسولُهُ، وكَلِمَتُهُ ألْقاها إلى مَرْيَمَ ورُوحٌ منه، والجَنَّةُ حَقٌّ، والنَّارُ حَقٌّ؛ أدْخَلَهُ اللَّهُ الجَنَّةَ علَى ما كانَ مِنَ العَمَلِ. ﴿وفي رِواية زادَ﴾: مِن أبْوابِ الجَنَّةِ الثَّمانِيَةِ، أيَّها شاءَ)).[١٦٧]

**واته: له عباده كوری صامت ( خوا لی رازی بێت ) ده گێرتەوه دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :** ئەوەی شاهێدی بدات به ( لا إله إلا الله - هیچ پەرستراوێک هەق وڕاست نییە جگە لە الله) وتەنیا الله شایەنی پەرستنە وهیچ هاوبەشێکی نییە، وشاهێدی بدات بە (محمد عبده ورسولە - موحەمەد -صلی الله علیه وسلم- بەندە وپێغەمبەری خودایە) وشاهێدی بدات بە (عیسی عبد الله ورسولە - وعیساش بە هەمان شێوە بەندە وپێغەمبەری خودایە) وعیسا وشەی خودایە کە ناردی بۆ مەریەم ورۆحێکە لە لایەن خوداوە، وشاهێدی بدات بەوەی کە بەهەشت هەق وڕاستییە، ودۆزەخ هەق وڕاستییە؛ ئەوا خوای گەورە ئەم کەسە دەکاتە بەهەشتەوە ئەگەر هەر کردەوەیەکی ئەنجام دابێت..!!

**تیبینی** /ئەم فەرموودەیە پێمان ڕادەگەیەنێت هەرکەسێک وشەی تەوحید) یەک خوا پەرستی (بڵێت و واتای بزانێت وکردەوەی پێبکات وشاهێدی بدات بە بەندایەتی موحەمەد -صلی الله علیه وسلم- وپەیامەکەی، ودان بنێت بە بەندایەتی عیسا وپەیامەکەی کە بە وشەی خودا دروستکراوە ئەویش) کن - ببە (لە ناو مەریەمدا، ومەریەمی دایکی بە دوور بزانێت لەو بوهتان وتۆمەتە درۆیانەی کە جولەکەی دوژمن بۆی هەڵدەواسن، وباوەڕی وا بێت کە بەهەشت بوونی هەیە بۆ ئیماندارانە ودۆزەخ بوونی هەیە بۆ کافرانە، ولە سەر ئەم بیروباوەڕانە بمرێت ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە ئەگەر هەر کردەوەیەکی ئەنجامدا بێت..!!

[١٦٧] صحيح البخاري برقم (٣٤٣٥) و مسلم برقم (٢٨).

(١٦٨) عن انس بن مالك رضي الله عنه قال : قال رسول ﷺ :

((إنَّ الكافِرَ إذا عَمِلَ حَسَنَةً أُطْعِمَ بها طُعْمَةً مِنَ الدُّنْيا، وأَمَّا المُؤْمِنُ، فإنَّ اللَّهَ يَدَّخِرُ له حَسَناتِهِ في الآخِرَةِ ويُعْقِبُهُ رِزْقًا في الدُّنْيا علَى طاعَتِهِ )).وفي رواية : ((نَّ اللَّهَ لا يَظْلِمُ مُؤْمِنًا حَسَنَةً، يُعْطَى بها في الدُّنْيا ويُجْزَى بها في الآخِرَةِ، وأَمَّا الكافِرُ فيُطْعَمُ بحَسَناتِ ما عَمِلَ بها لِلَّهِ في الدُّنْيا، حتَّى إذا أفْضَى إلى الآخِرَةِ، لَمْ تَكُنْ له حَسَنَةٌ يُجْزَى بها )) .[١٦٨]

واتە : لە انس کوری مالك ( خوا لی رازی بیت ) دە گیرتەوە دەلیت : پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :

اتێک کافر) بێباوەڕ (چاکەیەک دەکات؛ ڕزقێکی پێدەبەخشرێت لەم دونیایەدا، بەڵام ئیماندار خوای گەورە چاکەکانی بۆ دەپارێزێت) بۆئەوەی پاداشتی بداتەوە (لە قیامەتدا، وڕزقی پێدەبەخشێت لە دونیادا بەهۆی گوێڕایەڵبوونی .«ولە گێرانەوەیەکدا» :خوای گەورە ستەم ناکات لە ئیماندار) تەنانەت (هێندەی یەک چاکەیش بێت، بەهۆیەوە لە دونیادا) ڕزقی (پێدەبەخشرێت، ولە قیامەتدا بەهۆیەوە پاداشتی دەدرێتەوە، بەڵام کافر) بێباوەڕ (ئەگەر چاکەیەک بکات ڕزقی پێدەبەخشرێت ئەگەر لە پێناو خوای گەورە ئەنجامیدا بێت، هەتاوەکو ئەگەر بگات بە قیامەت، هیچ چاکەیەکی نییە بۆئەوەی لەسەری پاداشت بدرێتەوە ..!!

[١٦٨] صحيح مسلم برقم (٢٨٠٨).

**تیبینی / **

کاتێک کافر) بێباوەڕ (چاکەیەک دەکات؛ خوای گەورە ڕزقێکی پێدەبەخشێت لەم دونیایەدا، بەڵام ئیماندار ئەگەر چاکە وپەرستنێک ئەنجامبدات ئەوا خوای گەورە چاکەکانی بۆ دەپارێزێت بۆئەوەی پاداشتی بداتەوە لە قیامەتدا، وڕزقی پێدەبەخشێت لە دونیادا بەهۆی گوێڕایەڵبوونی .لە گێرانەوەی دووەمدا :خوای گەورە پاداشتی ئیماندار دەداتەوە لە دونیادا بەهۆی کردەوەکانی، وهەروەها لە قیامەتیش پاداشتی دەداتەوە، بەڵام کافر تەنها لە دونیادا پاداشت دەدرێتەوە ولە قیامەتدا پاداشت نادرێتەوە چونکە لەسەر کوفر وشیرک وبێباوەڕی مردووە هیچ چاکەیەکی نییە بۆئەوەی خوای گەورە لەسەری پاداشتی بداتەوە. وزانایان یەکدەنگن سەبارەت بەوەی ئەگەر کافر لەسەر کوفر وشیرک وبێباوەڕی بمرێت ئەوا لە قیامەتدا بە هیچ شێوەیەک پاداشت نادرێتەوە لەسەر چاکەیەک ئەگەرچیش مەبەستی نزیکبوونەوە بێت لە خوای گەورە، چونکە مەرجی پاداشت دانەوە لە قیامەتدا؛ مردنە لەسەر مسوڵمانێتی وئیمان، ولەم فەرموودەیەدا باسی ئەوە کراوە کە تەنها لە دونیادا ڕزقی پێدەبەخشرێت بەهۆی ئەو چاکانەی لە پێناو خوای گەورە ئەنجامیداوە، لەو کردەوانەی کە زۆر جار نیەتی چاکەی لەگەڵدایە وەکو گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی وخێرکردن وڕزگارکردنی بەندە ومیواندرێتی وئاسانکاری کاری خێر وچاکە بۆ خەڵکی وبەو شێوەیە .بەڵام کافر ئەگەر مسوڵمان بێت ئەوا لە قیامەتدا پاداشت دەدرێتەوە لەسەر ئەم کارانە ئەگەرچیش لەکاتی کافربوونی ئەنجامی دابێت بەهۆی فەرموودەی) :أسلمت على ما أسلفت من خير (واتە) :مسوڵمان بوویت لەگەڵ ئەو چاکانەش کە لە پێشووتردا ئەنجامتدا -بۆت دەنووسرێت-!!

(١٦٩) عن عبدالله بن مسعود رضي الله عنه قال:

((أنَّ يَهُودِيًّا جاءَ إلى النبيِّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ، فَقالَ: يا مُحَمَّدُ، إنَّ اللَّهَ يُمْسِكُ السَّمَوَاتِ علَى إصْبَعٍ، والأرَضِينَ علَى إصْبَعٍ، والجِبَالَ علَى إصْبَعٍ، والشَّجَرَ علَى إصْبَعٍ، والخَلَائِقَ علَى إصْبَعٍ، ثُمَّ يقولُ: أنَا المَلِكُ. فَضَحِكَ رَسولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ حتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ، ثُمَّ قَرَأَ: {وَما قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ}الانعام ٩١)).[169]

واته: لە عبداللهی كوڕی مەسعودوە (ڕەزای خوای لێبێت )دەڵێت:

جولەكەیەک هات بۆ لای پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم-، و ووتی :ئەی موحەمەد، خوای گەورە ئاسمانەكان ڕادەگرێت لەسەر پەنجەیەک، وزەوییەكان ڕادەگرێت لەسەر پەنجەیەک، وچیاكان ڕادەگرێت لەسەر پەنجەیەک، ودارەكان ڕادەگرێت لەسەر پەنجەیەک، وهەموو بوونەوەرەكان ڕادەگرێت لەسەر پەنجەیەک، پاشان دەفەرموێت :من پادشام(،» پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- پێكەنی هەتاوەكو ددانە خرێكانی دەركەوت«، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە} :وما قدروا اللهَ حقَّ قَدْرِهِ]{الانعام ٩١ واتە : كافران وبێباوەڕان خوای گەورەیان بە گەورەنەزانیوە ونەیان ناسیووە بەو جۆرەی شیاوی ئەو زاتەیە.

[169] صحيح مسلم برقم (٢٧٨٦).

**تیبینی** / ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر مەزنی خوای گەورە -سبحانە وتعالی- کە هەموو ئاسمانەکان لەسەر یەک پەنجە لە پەنجەکانی دەستی پیرۆز ومەزنی دادەنێت، وهەموو بوونەوەرە دروستکراوە زانراوەکان بە مەزن وگەورەییان لەسەر یەک پەنجە دایان دەنێت، وئەگەر خوای گەورە بیەوێت -سبحانە وتعالی- ئەوا هەموو ئاسمانەکان وزەوی وبوونەوەرەکانیش لەسەر یەک پەنجەی پیرۆزی دادەنێت. وئەمیش لەو زانستانەیە کە وەکو میرات لە پێغەمبەرانەوە ماوەتەوە کە ئەوانیش لە ڕێگەی وەحی) سروشی (ئاسمانەوە بۆیان دابەزیوە، بۆیە پێغەمبەر -ﷺ- قسەکەی جولەکەکەی بە ڕاستدانا وجێی سەرسوڕمانی بوو وپێی خۆش بوو، بۆیە پێکەنی هەتاوەکو ددانە خرێکانی دەرکەوت ئەمیش وەکو بە ڕاستدانانێک بۆ قسەکانی، ولە گێرانەوەیەکی تردا :پێغەمبەر - -ﷺئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾]الزمر: ٦٧[، واتە)} :کافران (خوایان نەناسیوە) بە گەورەیان نەزانی (بەو جۆرەی شیاوێتی لە ڕۆژی دواییدا هەموو زەوی لە چنگی ئەودایە) بەدەست خوایە (وئاسمانەکانیش بە دەستی ڕاستی ئەو پێچراونەتەوە،) لەم ئایەتەدا دووپاتکردنەوە وجێگیرکردن سیفەتی دەستی ڕاست بۆ خودا هاتووە ئێمە باوەڕمان پێیەتی، بەبێ هیچ لێچواندن ولێکدانەوەیەك وشێوەکەی نازانین، تەنها خودا دەیزانێت(، خودا پاك و بڵندترە لەو هاوبەشدانانە) شیرکانەی (کە هاوبەشدانەران) موشریکەکان (بۆ خوای گەورە بڕیاری دەدەن}، ئەم ئایەتە ئەوە دووپاتدەکاتەوە کە خوای گەورە دوو دەستی هەیە، ئەمیش وەکو دووپاتکردنەوەیەک بۆ قسەکانی جولەکەکە. ونابێت ئاوڕ بدرێتەوە بۆ قسەکانی ئەوانەی کە ڕاستی واتاکە پەکدەخەن ونایهێڵن، بۆیە ئینکار کردن ونەفی کردن بوونی پەنجەکان بۆ خوای گەورە، بەو بیانووەی کە ئەمە چواندنی پەروەردگارە بە بوونەوەرەکان، وئەو کۆمەڵە گومڕایەی کە واتای ڕاستەقینەی سیفەتەکانی خودا پەکدەخەن پێیان دەووترێت) المعطلة(؛ نازانن جێگیرکردن ودووپاتکردنەوە لە بوونی سیفەتێکی خودا مانای چواندنی نییە بە بوونەوەرەکان، هەروەکو چۆن ئێمە سیفەتی ژیان وتوانا وهێز وبینین بۆ خوای گەورە دووپات وجێگیر دەکەین کە ئەم سیفەتانەی هەیە ومانای ئەوە نییە بوونی ئەم سیفەتانە لە بوونەوەرەکاندا چواندنی پەروەردگار بێت بە بوونەوەرەکان، چونکە خوای گەورە ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾الشورى: ١١[، واتە} :هیچ شت و کەسێك لە خوای گەورە ناچێت) هیچ شتێک بە وێنەی خودا نییە؛ نە لە زاتی پیرۆز ومەزنی، ونە لە سیفات وکردارەکانیشی(، چونکە خوای گەورە تاك وتەنهایە ودروستکارە، وخوای گەورە بیسەر وبینایە، زۆر بیسەرە بەوتە وقسەتان، وزۆر بینەرە بە کردەوەتان، وهەموو شتێك دەبیستێت ودەبینێت..!!

# خوای گەورە فەرمانی دەکات بە فریشتەی رەحمی دایك

(١٧٠) عن أنس بن مالك رضي الله عنه قال : قال رسول الله ﷺ :

(( وَكَّلَ اللَّهُ بِالرَّحِمِ مَلَكًا، فيَقولُ: أيْ رَبِّ نُطْفَةٌ، أيْ رَبِّ عَلَقَةٌ، أيْ رَبِّ مُضْغَةٌ، فإذا أرادَ اللَّهُ أنْ يَقْضِيَ خَلْقَها، قالَ: أيْ رَبِّ، أذَكَرٌ أمْ أُنْثَى، أشَقِيٌّ أمْ سَعِيدٌ، فَما الرِّزْقُ، فَما الأجَلُ، فيُكْتَبُ كَذلكَ في بَطْنِ أُمِّهِ )) .[170]

واتە: لە أنس کوڕی مالیکەوە -ڕەزای خوای لێبێت- کە پێغەمبەر - ﷺ- دەفەرموێت» :خوای گەورە فریشتەیەکی دیاریکردووە تایبەت بە ڕەحم) منداڵدان(، فریشتەکە دەڵێت :ئەی پەروەردگار،) بوو بە (دڵۆپە ئاوێک مەنییەک، ئەی پەروەردگار،) بوو بە (تۆپەڵەیەک -عەلەقەیەک-، ئەی پەروەردگار،) بوو بە (پارچەیەک گۆشت، پاش ئەمە ئەگەر پەروەردگار بیەوێت خوڵقاندنی تەواو وکامڵ بکات، فریشتەکە دەڵێت :ئەی پەروەردگار، نێر یان مێ، خراپەکار یان چاکەکار، ئایا ڕزقەکەی چەندێک بێت؟ ئایا چەندێک دەژێت؟ هەموو ئەمانە دەنووسرێت لە کاتێکدا کۆرپەلە بچووکەکە لە ناو سکی دایکیدایە..!!

[170] صحيح البخاري برقم (٦٥٩٥) ومسلم برقم (٢٦٤٦) متفق عليه شروط الشيخين .

**تێبینی** /فەرموودەکە : خوای گەورە فریشتەیەکی دیاریکردووە تایبەت

بە ڕەحم -منداڵدان :(-خوای گەورە فریشتەیەکی کردووە بە بەرپرسیاری ڕەحم ئەمیش ئەو شوێنەیە کە منداڵ تێیدا گەشە دەکات لە سکی دایکیدا .فریشەکە دەڵێت) :ئەی پەروەردگار، (بوو بە (دڵۆپە ئاوێک -مەنییەک :(-واتا دڵۆپەیەک لە ئاوی باوکەکە .هەمان شت دەڵێتەوە لە قۆناغەکانی تردا) :ئەی پەروەردگار، (بوو بە (تۆپەڵەیەک -عەلەقەیەک-) کە ئەم تۆپەڵەیە پارچە خوێنێکی چڕە .پاشان دەڵێت) :ئەی پەروەردگار، (بوو بە (پارچەیەک گۆشت) کە بێگومان ئەم پارچە گۆشتە گەورەترە بە عەرەبی پێی دەووترێت: -مُضْغَة-، ولە گێڕانەوەیەکدا باسی ئەوە کراوە کە ماوەی نێوان هەر قۆناغێک لەمانە بریتیە لە چل ڕۆژ، پاشان پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم -فەرمووی) :پاش ئەمە ئەگەر پەروەردگار بیەوێت خوڵقاندنی تەواو وکامڵ بکات :(واتا پارچە گۆشتەکە گەشە بکات چونکە کۆتا قۆناغە، وکامڵکردنی خوڵقاندنی بە فووتێکردنی ڕۆحە بۆ ناو لاشەکە وئەمیش پاش ١٢٠ ڕۆژ ڕوو دەدات .فریشەکە دەڵێت) :ئەی پەروەردگار، نێر یان مێ (واتا ئەی پەروەردگار بنووسم نێر یان مێ؟) .خراپەکار یان چاکەکار :(واتا خراپەکارە وئەهلی دۆزەخە یان چاکەکارە وئەهلی بەهەشتە بۆ ئەوەی بەهەمان شێوە بینووسم؟) .ئایا ڕزقەکەی چەندێک بێت؟ :(ئایا ڕزقەکەی کەمە یان زۆر وئایا بڕی ئەم ڕزقە چەندێکە؟) .ئایا چەندێک دەژێت؟ :(ئایا تەمەنی چەند ساڵ دەبێت لە ژیاندا؟ کورت یان درێژ دەبێت؟) .هەموو ئەمانە دەنووسرێت لە کاتێکدا کۆرپەلە بچووکەکە لە ناو سکی دایکیدایە :(واتە ئەوانەی باسکراوە دەنووسرێت بەو شێوەیەی خوای گەورە فەرمانی پێکردووە لەکاتێکدا کە منداڵەکە لە ناو سکی دایکیدایە..!!

✍(١٧١)عن عبدالله بن عباس رضي الله عنهما : كنتُ خلفَ رسولِ اللهِ ﷺ يومًا قال يا غلامُ ، إني أعلِّمُك كلماتٍ : احفَظِ اللهَ يحفَظْك ، احفَظِ اللهَ تجِدْه تُجاهَك ، إذا سألتَ فاسألِ اللهَ ، وإذا استعنْتَ فاستعِنْ باللهِ ، واعلمْ أنَّ الأمةَ لو اجتمعتْ على أن ينفعوك بشيءٍ ، لم ينفعوك إلا بشيءٍ قد كتبه اللهُ لك ، وإنِ اجتمعوا على أن يضُرُّوك بشيءٍ لم يضُروك إلا بشيءٍ قد كتبه اللهُ عليك ، ( رُفِعَتِ الأقلامُ وجَفَّتِ الصُّحُفَ ) وفي راوية ((احفظ الله تجده أمامك تعرف إلى الله في الرخاء يعرفك في الشدة إذا سألت فاسأل الله وإذا استعنت فاستعن بالله فقد جف القلم بما هو كائن فلو أن الخلق كلهم جميعاً أرادوا أن ينفعوك بشيء لم يقضه الله لك لم يقدروا عليه وإن أرادوا أن يضروك بشيء لم يقضه الله لك لم يقدروا عليه واعمل لله بالشكر واليقين واعلم أن في الصبر على ما تكره خيراً كثيراً وأن النصر مع الصبر وأن الفرج مع الكرب وأن مع العسر يسراً)).[١٧١]

[١٧١] سنن الترمذي برقم (٢٥١٦) و عبد الحق الإشبيلي في (الأحكام الشرعية الكبرى ) (٣/٣٣٣).

واته : له عبدالله ی کوری عباس ( خوا لي رازي بيت ) دەڵێت :من ڕۆژێکیان بە سواری وڵاخێک لە پشتەوەی پێغەمبەری خوا -صلی الله عليه وسلم -بووم و بە منی فەرموو» : ئەی کوڕ) ئەی غوڵام(، هەندێک وشەت فێر دەکەم، سنوورەکانی شەریعەتی خودا بپارێزە؛ ئەوا خودا دەتپارێزێت، سنوورەکانی شەریعەتی خودا بپارێزە؛ ئەوا دەبینیت خودا لە پێشەوە لە گەڵ تۆدا دەبێت، ئەگەر داوات کرد؛ ئەوا تەنها داوا لە خودا بکە، وئەگەر داوای یارمەتی وپشتیوانیت کرد؛ ئەوا تەنها داوای یارمەتی وپشتیوانی لە خودا بکە، وبزانە بەڕاستی ئەگەر هەموو ئوممەت کۆببنەوە بۆ ئەوەی بە شتێك سوودت پێ بگەیەنن؛ ئەوا سوودت پێ ناگەیەنن تەنها بەو شتە نەبێت کە خودا بۆتی نووسیووە، وئەگەر کۆببنەوە بۆ ئەوەی بە شتێك زەرەر وزیانت پێ بگەیەنن؛ ئەوا زەرەر و زیانت پێ ناگەیەنن تەنها بەو شتە نەبێت کە خودا لە سەرتی نووسیووە، قەڵەمەکانی نووسینی قەدەر هەڵگیراون وپەڕەکانیش وشك بوونەتەوە». ولە ریوایەتێکی تردا هاتووە کە پێغەمبەری خودا -صلی الله علیه وسلم -بە ئیبن عەباسی فەرموو» :تۆ سنوورەکانی شەرعی خودا بپارێزە؛ ئەوا دەبینیت خودا لە پێشتەوە لە گەڵ تۆدا دەبێت، تۆ لە کاتی خۆشیدا خودا بناسە وبیپەرستە؛ ئەوا خودایش لە کاتی ناڕەحەتی وتەنگانەدا تۆ دەناسێت وڕزگارت دەکات، وبزانە بە ڕاستی ئەوەی کە تووشت نابێت ونایەتە ڕێت بۆی نەبووە تووشت ببێت وبێتە ڕێت ، وئەوەشی کە تووشت دەبێت ودێتە ڕێت؛ ئەوا بۆی نەبووە تووشت نەبێت ونەیەتە ڕێت، وبزانە بە ڕاستی سەرکەوتن لەگەڵ ئارامگرتندایە، وکرانەوەی دەرگای خێر وخۆشی لەگەڵ تەنگانەدایە، وخۆشگوزەرانیش لەگەڵ ناڕەحەتیدایە ..!! 

**تیبینی /ئەم فەرموودەیە :** پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- ڕێنمایی ئەم کوڕە) غوڵامە (دەکات کە ئەویش عبداللەی کوڕی عەباسە -ڕەزای خوایان لێبێت- بە هەندێک ڕێنمایی و وەسیەتی بەنرخ کە باس لەوە دەکات کە فەرمانەکانی خوای گەورە بپارێزێت وخۆی بە دووربگرێت لە نەهی لێکراوەکان لە هەموو حاڵەت وکات وشوێنێکدا، وپێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- بیروباوەڕی ئیبن عەباس ڕاست دەکاتەوە هەر لە منداڵیەوە، هیچ پەروەردگارێک نییە جگە لە الله، وهیچ تواناداریک نییە جگە لە الله، وهیچ کەس کاروباری بوونەوەرەکان ناباتە ڕێوە جگە لە الله، وهیچ کەس وشتێکی ناوەند) واسطة (نییە لە نێوان بەندە وپەروەردگاری لە تەوەکول وداواکردن وپاڕانەوەدا، هیوا تەنها بە خودایە لە کاتی دابەزینی ناخۆشییەکاندا، وتەنها ڕەجا بە ئەو دەکرێت لە کاتی دابەزینی سزاکاندا، وهەروەها پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- لە نەفسی ئیبن عەباسدا -ڕەزای خوایان لێبێت- باوەڕبوون بە قەدەری چەسپاند کە هەموو شتێک بە قەدەری خوای گەورە وقەزا وبڕیاری ئەوە لە خێر وشەڕ، وویست وبەجێهێنان لە دەستی مرۆڤەکان نییە بە ئەوەی کە بیانەوێت ئەنجامی بدەن وهیچ شتێک ڕوونادات جگە لەوە نەبێت کە خوای گەورە ئیزنی لە سەری داوە..!!

✍(١٧٢) عن عبدالله بن مسعود رضي الله عنه قال: سَأَلْتُ أوْ سُئِلَ رَسولُ اللَّهِ ﷺ: أيُّ الذَّنْبِ عِنْدَ اللَّهِ أكْبَرُ؟ قالَ: أنْ تَجْعَلَ لِلَّهِ نِدًّا وهو خَلَقَكَ. قُلتُ: ثُمَّ أيٌّ؟ قالَ: ثُمَّ أنْ تَقْتُلَ ولَدَكَ خَشْيَةَ أنْ يَطْعَمَ معكَ. قُلتُ: ثُمَّ أيٌّ؟ قالَ: أنْ تُزَانِيَ بحَلِيلَةِ جَارِكَ. قالَ: ونَزَلَتْ هذِه الآيَةُ تَصْدِيقًا لِقَوْلِ رَسولِ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليه وسلَّم: ﴿وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ﴾ الفرقان: ٦٨.

واته: له عبدالله کوری مسعود (خوا لی رازی بیت) دەلیت: پرسیارم له پێغەمبەری خودا - -ﷺکرد :ئایا چی تاوانێک گەورەترینه؟ - صلى الله عليه وسلم -فەرمووی» :هاوبەش وشەریک بۆ خوای گەورە بڕیار بدەیت له کاتێک ئەو تۆی دروستکردووە «ووتم: پاش ئەوەی چی) واته:چی تاوانێک؟ -ﷺفەرمووی» :منداڵەکەت بکوژیت له ترسی ئەوەی که له خواردنەکەت بخوات «ووتم: پاش ئەوەی چی؟ -صلى الله عليه وسلم -فەرمووی» :زینا بکەیت له گەڵ هاوسەری دراوسێکەت..!!هەروها بۆ پشت راست کردنەوەی قسه کانی پیغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی سورەتی فرقان هاته خوارەوە که (خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ﴾ الفرقان: ٦٨.

[١٧٢] صحيح البخاري برقم (٤٤٧٧) ومسلم برقم (٨٦).

**تیبینی / ئەم فەرمووده یە:** هاوەڵان -ڕەزای خوایان لێبێت- پرسیاری گەورەترین تاوانیان کرد، بۆیە پێغەمبەریش -صلی الله علیه وسلم- باسی گەورەترینیانی کرد کە ئەویش بریتیە لە شیرکی گەورە، کە خوای گەورە بە هیچ شێوەیەک لێی خۆش نابێت مەگەر بە تەوبەکردن نەبێت پێش مردن، وئەگەر کەسی موشریک بمرێت ئەوا بە هەتاهەتایی لە دۆزەخ دەمێنیتەوە. پاشان کەسێک منداڵەکەی بکوژێت لە ترسی ئەوەی خواردن لەگەڵی بخوات، بۆیە کوشتنی ئەو نەفسەی کە خوای گەورە حەرامی کردووە بکوژرێت لە پلەی دووەمدا دێت لە تاوانە گەورەکان، وتاوانەکە گەورەتر دەبێت وسزاکە زیاتر دەبێت ئەگەر کوژراوەکە پەیوەندی خزمایەتی بە بکوژەکەوە هەبێت، وهەروەها سزاکە زیاتریش دەبێت کاتێک مەبەست ئەوە بێت کە کوژراو دابېڕێت لە ڕزقێک کە خودا بۆی داناوە کە لە ڕێگای بکوژەکەوە بۆی دێت. پاشان کەسێک زینا بکات لە گەڵ خێزانی دراوسێکەی، زینا لە پلەی سێیەم دێت لە تاوانە گەورەکان، تاوانەکەی گەورەترە ئەگەر ئەوەی زینای لەگەڵدا کراوە خێزانی دراوسێکەی بێت کە لە شەرعدا فەرمان کراوە بە چاک بوون لەگەڵیان وباشی هاوەڵێتی کردنیان..!!

✍(١٧٣)عن ابي هريرة ﷺ قال : قال رسول الله ﷺ :

((الْمُؤْمِنُ القَوِيُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إلى اللهِ مِنَ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ، وفي كُلٍّ خَيْرٌ. احْرِصْ علَى ما يَنْفَعُكَ، وَاسْتَعِنْ باللَّهِ وَلَا تَعْجِزْ، وإنْ أَصَابَكَ شيءٌ، فلا تَقُلْ: لو أَنِّي فَعَلْتُ كانَ كَذَا وَكَذَا، وَلَكِنْ قُلْ: قَدَرُ اللهِ وَما شَاءَ فَعَلَ" فإنَّ (لو) تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ)).[173]

لە ابي هريرة (ڕەزای خوای لێبێت) دە لیت : پێغەمبەر ﷺدەفەرموێت : ئیمانداری بەهێز خێرترە وخۆشەویستترە لای خوای گەورە لە ئیمانداری لاواز، وهەموویان خێریان تێدایە، پێداگیر بە لەسەر ئەوەی سوودی بۆت هەیە، وداوای یارمەتی لە خوای گەورە بکە وبێ هیوا مەبە، ئەگەر ناخۆشیەکت تووش بوو، مەڵێ ئەگەر ئاوا وئاوام بکردایە، بەڵکو بڵێ :( قَدَرُ الله وما شاء فعل) چونکە ووتنی) ئەگەر (دەرگا بۆ شەیتان دەکاتەوە بۆ ئەوەی کردەوەی خۆی بکات) واتە: ئەوەی قەدەری خوای گەورە بوو ڕوویدا، وئەوەی ویستی جێبەجێ بوو..!!

[173] صحيح مسلم برقم (٢٦٦٤) و ابن تيمية في المجموعة الفتاوى (٣٣٨/٧).

**تێبینی / ئەم فەرموودەیە : باوەڕداری ئیمان بەهێز لە ئیمانیدا خێترە وخۆشەویستترە لای خوای گەورە لە باوەڕداری ئیمان لاواز، مەبەست لە بەهێزی لاشە نییە، ئەگەر ئیمانداری بەهێز ولاواز لە باوەڕدا یەکسان بوون، ئەوا باوەڕداری بەهێز سوودی بۆ خەڵکی تریش هەیە، بەڵام باوەڕداری ئیمان لاواز سوودی تەنها بۆ خۆیەتی، بۆیە ئیمانداری بەهێز باشترە لە ئیمانداری لاواز، وهەموویان خێریان تێدایە، بۆ ئەوەی نەیەت بە خەیاڵدا کە ئیمانداری لاواز خێری تێدا نیە، بەڵکو خێری تێدایە بە بێگومان. پاشان پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- ئامۆژگاری ئومەتەکەی کرد بە چەند وەسیەت وئامۆژگاریەکی وورد وگشتی، فەرمانی پێکردن بە کۆشش کردن بۆ بەدەستهێنانی ئەو شتانەی کە قازانجیان پێدەگەیەنێت چا چ لە ڕووی ئاینی ودینداریيەوە بێت یان لە ڕووی دونیاییەوە، ئەگەر پێکدادانێک هەبێت لە نێوان) سوودی دونیایی (و) ئەرک وفەرمانی ئاینی (ئەوا پێویستە لایەنی ئاینەکە پێشبخرێت، چونکە ئەگەر دینداری کەسێک چاک بێت ولەسەر ڕێگای ڕاست بێت ئەوا لە ڕووی دونیایشەوە دڵی خۆش دەبێت وحاڵی باش دەبێت. کەسێک حاڵی باش نابێت ئەگەر سوودی شتومەکی دونیا بخاتە پێش فەرمانەکانی ئاینی ئیسلام؛ ئەگەرچیش بۆ ماوەیەکی کاتیش خۆشی بەخۆیەوە ببینێت بەڵام سەرەنجامی هەر خراپە وتیاچوونە. وپێویستە مسوڵمان داوای یارمەتی لە خودا بکات وپشت بە ئەو زاتە مەزنە ببەستێت ئەگەرچیش لە شتێکی کەمدا بێت، وپێویستە تەمەڵ ولاواز وبێ هیوا نەبێت وئەوپەڕی توانای خۆی بخاتە گەڕ بۆ بەدیهێنانی ئامانجە بەسوودەکانی دینداری ودونیایی .پاشان فەرمانی پێکردن ئەگەر هەوڵ وکۆششی خۆیان دا وداوای یارمەتیان لە خوای گەورە کرد ولە پاش ئەمانە سەرەنجام پێچەوانەی ئەوەبوو کە دەیانویست ئەوا پێویستە نەڵێن :ئەگەر وامان بکردایە ئاوا وئاوا دەبوو؛ چونکە ئەمەی ڕوویدا لە سەرووی ویستی ئەوانەوەیە، بۆیە بەندە فەرمانی پێکراوە ئەوەی لە توانایدایە ئەنجامی بدات، چونکە بڕیار لە سەر هەموو شتێک لە لای خوای گەورە، ووتنی وشەی) ئەگەر (دەرگای وەسوەسە وچپەی شەیتان دەکاتەوە ودەبێتە هۆی دڵتەنگ بوون وخەفەت وپەشیمانی وخراپ بوونی باری دەروونی، بەڵکو پێویستە بڵێت) :قَدَرُ الله وما شاء فعل (واتە ئەمەی کە ڕوویدا بە ویستی خوای گەورە بوو و بە پێی قەزا وبڕیاری ئەو بوو.**

# هەموو كارو كردەوەیەك بە نیەتە

✍(١٧٤) عن عمر بن خطاب ﷺ قال: قال رسول الله ﷺ:

((إنَّما الأعمالُ بالنِّيَّاتِ وإنَّما لِكلِّ امرئٍ ما نوى فمن كانت هجرتُهُ إلى اللَّهِ ورسولِه فَهجرتُهُ إلى اللَّهِ ورسولِه ومن كانت هجرتُهُ إلى دنيا يصيبُها أو امرأةٍ ينْكحُها فَهجرتُهُ إلى ما هاجرَ إليْهِ)).[١٧٤]

لە عومەری کوڕی خەتابەوە (ڕەزای خوای لێبێت) کە پێغەمبەر ﷺدەفەرموێت : هەموو کار وکردەوەیەک بە پێی نیەت ومەبەستە، وهەموو کەسێکیش بە پێی نیەتەکەی پاداشت دەدرێتەوە، بۆیە ئەو کەسەی کۆچکردنەوەی بۆ لای خودا وپێغەمبەرەکەی بێت؛ ئەوا کۆچکردنەوەی بۆ لای خودا وپێغەمبەرەکەیەتی، وئەوەی کۆچکردنەوی بۆ شتومەکی دونیا بێت کە دەستی بهێنێت یان ئافرەتێک بێت کە مارەیی بکات؛ ئەوا کۆچکردنەکەی بۆ لای ئەو شتانەیە..!!

تیبیني / فە رمووده كە : ەمە فەرموودەیەکی مەزنە لەم بابەتەدا، وهەندێک لە زانایان بە سێیەکی ئیسلامی دادەنێن، ئیماندار بە پێی نیەتەکەی وچاکی مەبەستەکەی پاداشت دەدرێتەوە، ئەوەی کردەوەکانی بە دڵسۆزی بۆ خوای گەورە بێت ئەوا خودا قبوڵی دەکات ئەگەر کەمیش بێت بە مەرجێک بە گوێرەی سونەت بێت، وئەوەی کردەوەکەی بۆ ڕیایی بێت وبە دڵسۆزی بۆ خوای گەورەی نەبێت ئەوا ڕەت دەکرێتەوە ئەگەر کردەوەکە گەورەیش بێت. هەر کردەوەیەک مەبەست پێی جگە لە خودا بێت ئەگەر ئەم مەبەستە ئافرەت یان پارە یان پلەپایە یان جگە لەوانە بێت لە هەرشتێکی دونیا، ئەمانە ڕەت دەکرێنەوە بە ڕووی خاوەنەکەی، وخوای گەورە قبوڵی ناکات، چونکە دوو مەرجی قبوڵ بوونی کردەوەی چاک بریتین لە:کردەوەکە بە دڵسۆزی بۆ خوای گەورە بێت، وبە پێی سونەتی پێغەمبەر ﷺ بێت..!!

[١٧٤] ابن تيمية امجموعة الفتاوى (٢٢٣/٢٠) و البخاري برقم (٥٤) و مسلم برقم (١٩٠٧).

✍(١٧٥) عن ابن الدَّيْلَمِي قال: أتيتُ أُبَيَّ بن كعب فقلتُ: في نفْسي شيء من القدر، فحَدِّثْني بشيء لعل الله يُذْهِبَه مِن قلبي .فقال» :لو أنفقتَ مثل أُحُد ذَهَبًا ما قَبِلَه الله منك حتى تؤمن بالقَدَر، وتعلمَ أنَّ ما أصابك لم يكن ليُخطِئك، وما أخْطأك لم يكن لِيُصِيبَك، ولو مُتَّ على غير هذا لكنتَ مِن أهل النار .«قال :فأتيتُ عبد الله بن مسعود، وحذيفة بن اليمان، وزيد بن ثابت، فكلهم حدَّثني بمثل ذلك عن النبي ﷺ)).[175]

لەئیبن دەیلەمیەوە(خوالي رازي بيت) دەڵێت: هاتم بۆ لای ئوبەی کوڕی کەعب، ووتم :شتێک هەیە لە دڵمدا سەبارەت بە قەدەر، شتێکم پێ بڵێ؛ بەڵکو خوای گەورە لەسەر دڵمی لابەرێت، ئەویش ووتی» :ئەگەر بە قەد شاخی ئوحود ئاڵتون ببەخشیت ئەوا خوای گەورە لێت قبوڵ ناکات هەتا باوەڕ بە قەدەر دەهێنیت، وبزانیت ئەوەی تووشت بووە بۆی نەبووە تووشت نەبێت ونەیەتە رێت، وئەوەی تووشت نەبووە بۆی نەبووە تووشت بێت وبێتە رێت، وئەگەر لەسەر بیروباوەڕێکی تر جگە لەمە بمریت؛ ئەوا لە ئەهلی دۆزەخیت) واتە: ئەگەر باوەڕت بە قەزا وقەدەری خودا نەبێت ئەوا لە ئەهلی دۆزەخیت .«(ئیبن دەیلەمی دەڵێت» :هاتم بۆ لای عبداللهی کوڕی مەسعود، وحوزەیفەی کوڕی یەمان، وزەیدی کوڕی سابت، هەموویان هەمان شتیان بۆ گێڕامەوە کە لە پێغەمبەرەوە ئەمەیان بیستبوو ﷺ..!!

[175] سنن ابو داود برقم (٤٦٩٩) و ابن ماجه برقم (٧٧) صحيح مسند

